# مەبەستەكانی شەریعەت

## رێبەرێک بۆ خوێنەری ئاسایی






پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی ٢٠



سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی خۆشحاڵە ئەم رێبەرە پێشکەش دەکات، کە ناسینێک لەخۆ دەگرێت بۆ بابەتی مەبەستەکانی شەریعەت، کە بریتین لە ئامانجە گەورەکانی یاسادانانی ئیسلامیی، نووسەرەکەی (د. جاسم عۆدە) زانایەکی هەمە پسپۆڕییە، بەڵام تایبەتمەندە لە بواری مەبەستەکانی شەریعەتدا.


مەبەستەكانی شەریعەت

رێبەرێک بۆ خوێنەری ئاسایی

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

(٢٠)

# مەبەستەکانی شەریعەت

## ڕێبەرێك بۆ خوێنەری ئاسایی

نووسینی: جاسر عۆدە

وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: عەبدوللەتیف خەیات

وەرگێڕانی بۆ کوردی: د. ئیسماعیل بەرزنجی


چاپی یەکەم

١٤٣٣ ك ٢٠١٢ ز





ناوی کتێب: مەبەستەکانی شەریعەت.. ڕێبەرێك بۆ خوێنەری ئاسایی.

نووسینی: جاسر عۆدە.

وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: عەبدوللەتیف خەیات.

وەرگێڕانی بۆ کوردی: د. ئیسماعیل بەرزنجی.

لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی و

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، ژمارە (٢٠).

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٨٠٦)ی ساڵی (٢٠١٢)ی دراوەتێ.

چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١٢.

چاپخانە: شڤان.

تیراژ: (١٠٠٠) دانە.

ئیمەیلی پەیمانگا: iiitkurdistan@yahoo.com

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## دەستپێك

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی خۆشحاڵە کە ئەم ڕێبەرە پێشکەش دەکات، کە ناسینێك لەخۆدەگرێت بۆ بابەتی مەبەستەکانی شەریعەت، بریتین لە ئامانجە گەورەکانی یاسادانانی ئیسلامیی، نووسەرەکەی (د. جاسر عۆدە) زانایەکی هەمەپسپۆڕییە، بەڵام تایبەتمەندە لەبواری بابەتی مەبەستەکانی شەریعەتدا.

لەبەرئەوەی تەنها ژمارەیەکی کەم کتێب هەیە دەربارەی مەبەستەکان بە زمانی ئینگلیزیی، پەیمانگای جیهانیی بڕیاریدا ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە بەوەی توانای پێویست ئاڕاستە بکات بۆ وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی زنجیرەیەك کتێب لە بابەتی مەبەستەکان، ئەمەش بۆ ئەوەی کە ئەم بابەتە چڕوپڕە پێشکەش بکات بە زمانی ئینگلیزی، لەم بوارەشدا پەیمانگا ئەم کتێبانەی بڵاوکردووەتەوە، مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلامیی لە نووسینی شێخ موحەممەد تاهیر بن عاشوور، تیۆری مەبەستەکان لەلای ئیمامی (شاتبی) لە نووسینی (ئەحمەد رەیسونی)، بەرەو کاراکردنی مەبەستەکانی شەریعەت لە نووسینی (د. جەمالەددین عەتییە)، هەروەها کتێبی مەبەستەکانی شەریعەت فەلسەفەی یاسادانانی ئیسلامیی: تێڕوانینێکی سیستماتیکی لە نووسینی (د. جاسر عۆدە) ئێستا لە ژێر وەرگێڕاندایە بۆ زمانی عەرەبی.

لەبەرئەوەی ئەم بابەتە چڕوپڕ و بەیەکالکاوەو ئاستەنگی زەینیی زۆری دێتەپێش، لە هەمان کاتدا زۆربەی ئەو کتێبانەی لەم بوارەدا نووسراون بەشێوەیەکی سەرەکی ڕوویان لە پسپۆڕ و زانایان و گەورە ڕوناکبیران بووە، بۆیە

نووسـینگەی لەنـدەنی پـەیمانگای جیهـانیی فیکـری ئیـسلامیی لـەپاڵ ئەمانـەدا کتێبگەلێکی ڕێنمووکار و ئاسانی لەم بابەتـەدا بڵاوکردووەتـەوە، بـۆ ئـەوەی ببنـە بەشێك لە زنجیرە کتێبە وەرزییەکان، ئەمەش بۆ ئەوەی کۆمەڵێك بابەتی ئاسـان و گونجاو بۆ خوێنەری ئاسایی دابینبکات.

ئەم ونجیرەیەش بێجگـە لـەم نامیلکەیـە کۆمـەڵێکیتر لـەخۆی دەگـرێ، وەکـو: (ڕێبەری ئاسان بۆ مەبەسـتەکانی شـەریعەت) لـە نووسـینی (د. موحەممـەد هاشـم کەمالی) و (تێڕوانینی ئیسلامیی بـۆ گەشـەپێدان لـە ژێـر ڕۆشـنایی مەبەسـتەکانی شەریعەتدا) لە نووسینی (موحەممەد عومەر چابرا) کە ئەمەیان بۆ زمـانی عـەرەبی وەرگێڕراوە و بەمزوانە بڵاودەکرێتەوە بە ویستی خوا.

**د. ئەنەس شێخ عەلی**

**ڕاوێژکاری ئەکادیمیی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی**

**نووسینگەی لەندەن**

**کانوونی دووەم/ ٢٠١٠ز – ڕەجەبی ١٤٣١ ك**

# پێشەکی نووسەر دەربارەی ئەم کتێبەو وەرگێڕانەکەی

گرنگیدانی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی بە زانستی مەبەستەکانی شەریعەت کۆنە و دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دامەزراندنی ئەم پەیمانگا ڕەسەنە، لە دەیەی هەشتەمی سەدەی ڕابردوودا، هەروەکو ڕوونە لە بڵاوکراوە جۆراوجۆرەکانیدا و لە چالاکییە بەردەوامەکانیدا ئەم باسەی نوێکردەوە لە هەموو جیهانی ئیسلامییدا، دواتر لەم پێنج ساڵەی دواییدا پەیمانگا چالاکییەکانی پەرەپێدا لە بواری ئەم زانستەدا ـ زانستی مەبەستەکانی شەریعەت ـ بە زمانی ئینگلیزی، بۆیە کۆمەڵێك دیدار و خول و وانەی ڕێکخست لە چەندین وڵاتدا، هەروەکو چەند بڵاوکراوەیەکی چاپکرد لە وەرگێڕانی کتێب لە زمانی عەرەبییەوە و توێژینەوە بە زمانی ئینگلیزی.

منیش توێژینەوەیەکی سادەم نووسی بە زمانی ئینگلیزی کە پەیمانگا بڵاویکردەوە ڕێزم هەیە بۆیان، بە ناونیشانی (مەبەستەکانی شەریعەت فەلسەفەی یاسادانانی ئیسلامیی: تێڕوانینێکی سیستماتیکی)، بەڵام قەبارەی کتێبەکە و زمانە تایبەتیەکەی وایانکرد خوێنەرێکی زۆر سوودی لێوەرنەگرن وەکو پێویست، بۆیە برای بەڕێزم دکتۆر ئەنەس شێخ عەلی ڕاوێژکاری ئەکادیمی پەیمانگا لە بەریتانیا ـ خوا پاداشتی بداتەوە ـ داوای لێکردم بە زمانی ئینگلیزی نامیلکەیەکی ئاسان بنووسم دەربارەی ئەم زانستە، وەکو ڕێبەرێك بۆ خوێنەرانی ئاسایی، وەکو ئەوە لە زمانی ئینگلیزیدا باوە بۆ ئەو کتێبانەی دەسپێکن یاخود ڕێخۆشکەرن بۆ زانستە جۆراوجۆرەکان، منیش ئەمەم نووسی بۆ ئەوەی خوێنەری مسوڵمان کە پسپۆڕ نییە لە بوارەکەدا بیخوێنێتەوە تا بیباتە ناو بابەتەکەوە، یان نامسوڵمانێك کە بەدوای پێشەکیەکدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی لە مەبەست و فەلسەفەی یاسادانی ئیسلامی تێبگات، لەمەدا مەبەستەکەی دێتەدی.

دواتر زۆرم پێخۆش بوو وەرگێڕانەکەی ببینم بۆ زمانی خۆمان (واتە عـەرەبی)، ئـــەویش ئـــەو وەرگێڕانەیـــە کـــە لەبەردەســـتی خوێنـــەری بەڕێزدایـــە، جێگـــای دەسخۆشییە کە دکتۆر عەبدوللەتیف خەیات پێی هەستا ـ خوا پاداشتی بداتـەوە ـ زۆر بـەجوانی ئەنجامیـدا، بەشـێوەیەك کـە ماناکـانی بـەزمانێکی عـەرەبی ئاسـان وەرگێڕاوە، لەکاتێکدا توانیوویەتی پارێزگاری لە وردیی هێنانی دەقی جۆراوجۆر و ڕاسـتی و دروسـتی زاراوە شـەرعی و یاسـایی و فەلـسەفییەکان بکـات، ئەمـەش وایکـــردووە خوێنـــەری ئاســـایی دوورکەوێتـــەوە لـــە مانـــدووبوون بـــە زمـــانی پـسپۆڕەکانەوە، بـەڵام فێرخـوازانی شـەرعی کـە گرنگیـی بـە بابەتەکـە دەدەن، ئاراســـتە دەکـــەم بـــۆ کتێبێکـــی تـــرم (فیقهـــی مەبەســـتەکان، گرێـدانی حوکمـە شەرعییەکان بە مەبەستەکانیانەوە) ئەمەش لە بڵاوکراوەکـانی پەیمانگایـە (چـاپی سێیەمی ٢٠٠٨)، سەرەڕای چەندین کتێب و توێژینەوە کە خەڵکانیتر نووسـیوویانە بە زمانی عەرەبی و غەیری عەرەبی.

لەکۆتاییـدا لـەخوا دەپاڕێمـەوە کـە هەڵسوڕاوانی پـەیمانگا سـەرفراز بکـات، و زانستی مەبەستەکانیش زیندوو بکاتەوە لەناو ئەم ئوممەتەدا و بەرفراوانی بکات.

**جاسر عۆدە – دەوحە**

**کانوونی دووەمی ٢٠١٠ ز**

**رەجەبی ١٤١٣ ك**

# بەشی یەکەم:
# مەبەستەکان چین؟

## ئاستەکانی (بۆچی)؟

زۆرجار ڕوودەدات لەپڕ منداڵان بە پرسیاری فەلسەفی ڕووبەڕوومان دەبنەوە، ئینسان نازانێ ئەم پرسیارانە بە مەبەستەوە دەکەن یان بەبێ مەبەست، بەڵام ئەوەی کە جوانە لە پرسیاری منداڵدا ئەوەیە زۆربەی کات لە (ڕاستی) پێشوەختەوە دەرناچن، لە لۆژیکێکەوە کە پێشتر فێری بووبێت لە کەسانیترەوە سەرچاوە ناگرن، وەکو قسەی گەورەکانی کە دەڵێت (ئەمە سروشتی شتەکانە)، زۆرجار من بابەتی موحازەرەکانم لە مەبەستەکانی شەریعەتدا بە چیرۆکی ئەو کچە بچووکە دەست پێدەکەم کە لە باوکی ئەپرسێت: باوکە بۆچی لەبەردەم هێمای هاتوچۆدا دەوەستی؟ باوکیشی لە وەڵامدا بەشێوازی مامۆستایەك دەڵێت: لەبەرئەوەی گڵۆپی سوور داگیرساوە، گڵۆپی سووریش واتە وەستان، بەڵام ئەو جارێکی تر دەپرسێت: بەڵام بۆچی؟ باوکی وەڵامی دەداتەوە جارێکیتر بە شێوازی پێشوو و دەڵێت: بۆ ئەوەی پۆلیسی هاتوچۆ سەرپێچیم بۆ نەنووسێت، بەڵام دیسان کچەکە دەپرسێت: ئەی بۆچی پۆلیسی هاتوچۆ سەرپێچیت بۆ دەنووسێت؟ باوکی دەڵێت: باشە، بۆئەوەی تێپەڕاندنی گڵۆپی سوور مەترسی بەدواوەیە، کچەکە بەردەوام دەبێت لەسەر پرسیار کردن و دەڵێ: باشە بۆچی؟ باوکە لەوکاتەدا بیردەکاتەوە کە ئەو دەستەواژە باوەی پێ بڵێت: چونکە سروشتی شتەکان ئاوایە، بەڵام بڕیار دەدا پشوودرێژتر بێت بەرامبەر پرسیارە زۆرەکانی کچە خۆشەویستەکەی، لەبەرئەوە وەڵامەکەی ئاوا دەداتەوە: چونکە نامانەوێ ئازاری خەڵکی بدەین، تۆ حەز دەکەی تووشی ئازار ببیت؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر، باوکیشی دەڵێ: دەی خەڵکیش نایانەوێ تووشی ئازار ببن،

پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسـەر بێـت) دەفـەرموێت: (ئـەوەی بـۆ خـۆت پێـت خۆشـە بـۆ خـەڵکیش پێـت خـۆش بێـت) بـەڵام کـچە ناوەسـتێت لـە پرسـیار و دەپرسێت: بەڵام بۆچی دەبێ ئەوەی بۆ خۆمان پێمان خۆشە بۆ خـەڵکیش پێمـان خۆش بێت؟ باوکە تۆزێك بیردەکاتەوە پـێش ئـەوەی بڵێـت: لەبەرئـەوەی خـەڵکی هەموویان چوونیەکن، بەڵام ئەگەر دیسان وتت: بۆچی؟ ئـەوا دەڵـێم: چـونکە خـوا دادگەرە و لەدادگەریشیەوەیەتی کە هەموومانی وەکـو یـەك لێکـردووە، هـەموومان وەکو یەك مافمان هەیـە و هـەر لەسـەر بنـچینەی دادگـەریش بوونـەوەری دروسـت کردووە.

پرسـیارکردن لـە (بۆچـی؟) واتـە پرسـیارکردن لـەوەی (مەبەسـتەکان چـین؟) ئەمـەش واتـە پرسـیارکردن لـە (ئاسـتەکانی گـەڕان بـەدوای "بۆچـی"دا)، ئـەم دەربڕینانە لە چەمك و دەربڕینـی فەیلەسووفەکان دەچـن، هـەر ئەوانەشـن دەبنـە هۆی گەڕان بەدوای (ئاستەکانی مەبەستەکان)دا بەپێی تێگەیشتنی زانایانی فیقهی ئیسلامیی.

کاتێك دەمانەوێ لە ئاستەکانی (بۆچی یـان لەبەرچـی)ەوە دەسـت پێبکـەین و بـچینە نـاو مەبەسـتەکانەوە، ئـەوە بایـەخمان دەگۆڕێـت لـە باسوخواسـی شـتە سادەکانەوە، لە ئاماژە ڕوونەکانەوە وەکو وەستان لەبەردەم هێمـای سـووردا، لـە ئاستی کردەوە و ئامـاژەوە بـۆ ئاسـتی یاسـا و ڕێـسا، وەکـو یاسـاکانی هاتوچـۆ، ئاسـتی یاسـا و ڕێـساکان دەمانگەیەنێتـە ئاسـتی بەرژەوەندییـە هاوبەشـەکان و سـوودەکان، وەکـو بیرکردنـەوەی ئینـسان لـە سـەلامەتی ئـەوانیتر، لەبەرامبـەردا ئەوانیش بیر لە سەلامەتی ئەو دەکەنەوە، لـە کۆتاییـدا لـە ئاسـتی بەرژەوەنـدی و سوودە هاوبەشەکانەوە بۆ ئاستی بنـەما گـەورەکان و بیروبـاوەڕە بنـچینەییەکان، وەکو بنەمای دادگەریی و بەزەیی و سیفەتەکانی خوای گەورە.

کەواتە مەبەستەکانی شەریعەت بریتین لەو لقەی زانستی ئیسلامیی کە وەڵامـی هەموو ئەو پرسیارە قورسانە دەدەنـەوە کـە لـە وشـەی (بۆچـی یـان لەبەرچـی)دا

خۆیان دەبیننەوە، لـە هـەموو بوارەکانـدا، ئێمـە لێـرەدا کۆمـەڵێك لـەو پرسـیارانە دەخەینە ڕوو:

- ❖ بۆچی زەکات یەکێکە لە بنەماکانی ئیسلام؟
- ❖ بۆچی یەکێك لە پێویستییە ئیسلامییەکان چاکەکردنە لەگەڵ دراوسێدا؟
- ❖ بۆچی سەلامی مسوڵمانان سەلامە؟
- ❖ بۆچی مسوڵمانان لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج جار نوێژ دەکەن؟
- ❖ بۆچی ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان یەکێکە لە بنەماکانی ئیسلام؟
- ❖ بۆچی مسوڵمانان زیکری خوا دەکەن؟
- ❖ بۆچی خواردنەوەی مـەی ئەگـەر کـەمیش بێـت گونـاهێکی گەورەیـە لـە ئیسلامدا؟
- ❖ بۆچی سزای لە سێدارەدان لە یاسای ئیسلامدا بۆ ئیغتـصاب و کوشـتنی بە ناحەق دانراوە؟

مەبەستەکانی شەریعەت حیکمەت و ئاماجی پـشت یاسـاکان ڕوون دەکەنـەوە، بۆ نموونە حیکمەتی بەهێزکردنی پەیوەندی کۆمەڵایـەتی یەکێکـە لـە ئامانجـەکانی زەکات و چاکە لەگەڵ دراوسێ و سەلامکردن.

یـەکێك لـە حیکمەتـەکانی تـری پـشت ئەحکامـە شـەرعییەکان بریتییـە لـە (پارێزکاریی ـ التقوی)، هەروەها یەکێکە لـە هۆکارەکـانی پێویـست بـوونی نوێـژ و زەکات و ڕۆژوو.

هەروەها مەبەستەکان بریتین لە کۆمەڵێك ئامانجی پاك و باش یاساکان هـەوڵی بەدیهێنانیان دەدەن بە قەدەغـەکردنی هەنـدێك شـت و ڕێگـەدانی هەنـدێکیتر، بـۆ نموونـــە یـــەکێك لـــە مەبەســـتەکان (پاراســـتنی عـــەقڵ و ڕوحـــی خـــەڵك)ە، ئەمەحــەرامکردنی تــەواوەتی بێهۆشـکەرەکانمان بـۆ ڕوون دەکاتــەوە، هــەروەها

مەبەستی (پاراستنی کالاّ و ئابڕووی خەڵك) تەفسیری (ئەگەری کوشتنمان) لە قورئاندا بۆ دەکات بۆ ئیغتصابکردن و چەتەیی (هەوەکو لە هەردوو ئایەتی ١٧٨ی سورەتی (البقرة) و ٣٣ی سورەتی (المائدة)دا دیارە).

هەروەها مەبەستەکان کۆمەڵێك ئامانجی خوایی و چەمکی ڕەوشتین کە یاسای ئیسلامیی لەسەریان دادەمەزرێت، وەکو بنەمای دادگەریی، بەهای مرۆڤ و توانای ئازاد، پیاوەتی، پاکداوێنیی، ئاسانکاریی لەسەر خەڵکی، هاوکاریی کۆمەڵایەتی، ئەم ئامانج و مەبەستانە پردێکی پەیوەندین لە نێوان یاساکانی ئیسلام و چەمکە هەنووکەییەکان دەربارەی مافەکانی مرۆڤ و گەشەپێدان و دادگەریی کۆمەڵایەتی، دەکرێ ببنە وەڵام بۆ کۆمەڵێك پرسیاری لەم چەشنە:

❖ باشترین ڕێگا چییە بۆ خوێندنەوەی قورئان و سوننەت و سەرلەنوێ تەفسیرکردنەوەیان بۆ ڕاستییە هەنووکەییەکانی جیهانی ئەمڕۆ؟

❖ تێگەیشتنی ئیسلامیی چییە بۆ (ئازادی) و (دادگەریی)؟

❖ خاڵی هاوبەش چییە لە نێوان چەمکە هەنووکەییەکان دەربارەی مافی مرۆڤ و یاساکانی ئیسلام.

❖ شەریعەتی ئیسلامیی چۆن دەتوانێت هاوبەشی بکات لە گەشەپێدان و ڕەوشت و دادگەریی کۆمەڵایەتیدا؟

با وێستگەی یەکەممان پێناسەی هەندێك زاراوە و لێکۆڵینەوەی مەبەستەکان بێت.

## له نێوان هەردوو چەمكی (مەبەستەكان) و (بەرژەوەندییەكان)دا

زاراوەی (مەبەستەكان ـ المقاصد) كۆكراوەی (مەبەست ـ مقصد)ە، هەروەكو روونە ئاماژە بۆ ئامانج و مەبەستی دیاریكراو دەكات، بەرامبەر وشەی (end)ی ئینگلیزییە[1]، یاخود (تیلۆس) بەزمانی یۆنانی، یان (فینفالیتی) به فەرەنسی، یان (زفیك) به ئەڵمانی[2]، بەڵام له شەریعەتی ئیسلامدا مەبەستەكان بریتین لە ئامانج و مەبەست یان داواكراو له هۆكاری حوكمە شەرعییەكان[3]، هەندێ له شارەزایانی فیقه پێیانوایە مەبەستەكان یەكسانن لە رووی مانـاوە بـە (بەرژەوەندییـەكان)، عەبدولمەلیك جوەینی (٤٧٨ك ـ ١٠٨٥ز وەفاتی كردووە)، له یەكەمـەكانی زانایانـە كە بەشداریی تیۆری (مەبەستەكان)ی كردووە و گەشـەی پێـداوە تـا گەیـشتووەتە ئەوەی ئەمرۆ (پاش كەمێكی تر روونی دەكەمەوە)، ئەو زاراوەی (مەبەسـتەكان)ی بەكارهێناوە لەبەرامبەر (بەرژەوەندییـەكان)دا، لای ئـەو هاومانـان[4]. لـەدوای ئـەو ئەبو حامیدی غەزالی هات (ساڵی ٥٠٥ك ـ ١١١١ز وەفـاتی كـردووە) لەسـەر هـەمان بنـچینەی جـوەینی مەبەسـتەكانی پـۆلێنكردووە[5]، خـستوونیەتە ژێـر ناونیـشانی (بەرژەوەندییە رەهاكراوەكان ـ المصالح المرسلة). لـەدوای ئـەوانیش فـەخرەدینی رازی (٦٠٦ك ـ ١٢٠٩ز وەفــاتی كــردووە) و ئامــەدی (٦٣١ك ـ ١٢٣٤ز وەفــاتی

---

١ . محمد الطاهر بن عاشور، ابن عاشور، مقاصد الشريعة الإسلامية، ترجمة: محمد الطاهر الميساوي، لندن، واشنطن، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ٢٠٠٦، ص٢.

٢ . رودلف فون يرنغ، القانون وسيلة إلى غاية، ترجمة إيزاك هوسيك، ط٢، نيوجرسي ٢٠٠١، ص ٣٥.

٣ . ابن عاشور، مقاصد الشريعة الإسلامية، تحرير الطاهر الميساوي،كوالالامبور، الفجر، ١٩٩٩، ص١٨٣.

٤ . عبدالملك الجويني، غياث الأمم في التياث الظُلَم، تحرير عبدالعظيم الديب، قطر، وزارة الشؤون الدينية، ١٤٠٠هـ، ص٢٥٣.

٥ . أبو حامد الغزالي، المستصفى في علم الأصول، تحرير: محمد عبدالسلام عبدالشافي، ط١، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٤١٣، المجلد الأول، ص١٧٢.

کـردووە) دێـن، ئـەوانیش شـوێن غـەزالی کـەوتوون لـە زاراوەکانیانـدا[1]، ئینجـا نەجمـەدینی تـوفیی (٧١٦ك ـ ١٣١٦ز) پێناسـەی بەرژەوەنـدیی کـردووە بـەوەی بریتییە "لەو هۆکارەی دەمانگەیەنێتە مەبەستی یاسادانەر (واتە خوا و پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێـت))"[2]، بـەڵام قـەڕافی (١٢٨٥ك ـ ١٨٦٨ز) یاسـایەکی دانا و وتی: "یاسا: شەرع هیچ مەبەسـتێك دیـاری ناکـات ئەگـەر ئامـانجێکی پێـوە بەند نەبێت، بەرژەوەندییەك بەدی دەهێنێت، یان خراپەیـەك دوور دەخاتـەوە"[3]، ئەمەش بە واتای ئەوەی هەر مەبەستێك لە مەبەستەکان ـ هەروەکو وتمان بەمانای خـوازراو یـان مەبەسـت یـان ئامـانج ـ دانـراوە لـە شـەریعەتی ئیـسلامدا لـەپێناو (بەرژەوەندیی مـرۆڤ)دا، ئەمـەش بنـچینەی ئـەقڵی لـۆژیکی تیـۆری مەبەسـتەکانت دەداتێ.

## ڕەهەندەکانی مەبەستەکان

مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلامیی بە چەند شـێوەیەك دابەشـکراون، ئەمـەش بەپێی ئەو ڕەهەند و گۆشەنیگایەی شارەزای فیقھ لێوەی ڕوانیوویەتی، هەندێك لـە ڕەهەندەکانیش ئەمانەن:

١ ـ ئاستەکانی پێویستی، ئەمەش دابەشکردنێکی تەقلیدییە.

٢ ـ بواری حوکمەکان کە هەوڵی بەدیهێنانی مەبەستەکان دەدەن.

٣ ـ جۆری ئەو کەسانەی مەبەستەکان دەیانگرێتەوە.

٤ ـ ئاستی هەمەگیریی (شمولية) مەبەستەکان.

---

[1] . أبوبكر المالكي بن العربي، المحصول في أصول الفقه، تحرير: حسين علـي البـدري وسـعيد فـوده، ط١، عمان، دار البيارق، ١٩٩٩، المجلد الخامس، ص٢٢٢، والآمـدي، علـي أبـو الحسن، الإحكـام في أصـول الأحكام، بيروت، دار الكتاب العربي، ١٤٠٤، ص٢٨٦.

٢ . نجم الدين الطوفي، التعيين في شرح الأربعين، بيروت، دار الريان،١٤١٩، ص٤٧٨.

٣. شهاب الدين القرافي، الذخيرة، بييروت، دار العرب، ١٩٩٤، المجلد الخامس، ص٤٧٨.

بەڵام دابەشکردنی باو بۆ مەبەستەکان سێ ئاستی هەیە لە پێویستی ئەوانیش: پێویستییە بنەڕەتییەکان (الضروريات)، پێویستییەکان (الحاجيات)، بەباش زانراوەکان (التحسينيات)، دواتر زانایان پێویستییە بنەڕەتییەکانیان کردووە بە (پێنج) بەشەوە ئەوانیش: پاراستنی ئایین، پاراستنی نەفس، پاراستنی ماڵ، پاراستنی عەقڵ، پاراستنی وەچە[1]، هەندێك لە زانایان (پاراستنی ئابڕوو) شیان خستووەتە پاڵیان، بەڵام ئەوانیتر زۆرتر باسیان کردووە[2]، ئەو پێنج پێویستییەی سەرەوە زۆر گرنگن بۆ ژیان و مردنی خەڵکی، ژیانی مرۆڤ دەکەوێتە مەترسییەوە کاتێك عەقڵیان تووشی مەترسی ببێت، لێرەوەیە پێداگریی ئیسلام لەسەر حەرامکردنی (مەی) و مادە بێهۆشکەرەکان بەگشتی، هەروەها ژیانی مرۆڤایەتی دەکەوێتە مەترسییەوە کاتێك نەفسەکان نەپارێزران، بەگرتنەبەری ڕێوشوێنی پارێزگاریی لە نەخۆشی و ژینگە لە پیسبوون. لەمەوە تێدەگەین بۆچی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) حەرامیکردووە زیان بە هەر ئینسانێك بگەیەنین یان تەنانەت بە ئاژەڵیش.

هەروەها دەکرێ ژیانی مرۆڤایەتی بکەوێتە مەترسییەوە کاتێك تەنگژەیەکی ئابووری گشتی دروست دەبێت، لەبەرئەمە ئیسلام قۆرخکردن و سوو و جۆرەکانی گەندەڵی و فێڵی حەرامکردووە، هەروەکو دەبینین ئیسلام پایەیەکی بەرزی داوە بە پارێزگاریکردن لە وەچە و نەوە، ئەمەش نهێنی زۆرێك لە حوکمە شەرعییەکانە کە ئیسلام داینا‌ون بۆ ڕێکخستن و گرنگیدانی ئەوپەڕی باشی بە فێرکردنی منداڵ و خێزان، دوا شتیش کە پاراستنی ئایینە پێویستییەکی زۆر گرنگی مرۆڤەکانە، بەتایبەتی ژیانی دواڕۆژیان، چونکە ئیسلام وا دەڕوانێتە ژیان کە کاروانێکە

١ . الغزالي، المستصفى، المجلد الأول، ص١٧٢، وابن العربي، المحصول في أصول الفقه، المجلد الخامس، ص٢٢٢، الآمدي، الإحكام، المجلد الرابع، ص٢٨٧.

٢ . الغزالي، المستصفى، المجلد الأول، ص١٧٢، وإبراهيم الغرناطي الشاطبي، الموافقات في أصول الشريعة، تحرير: عبدالله دراز، بيروت، دار المعرفة، بدون تأريخ، المجلد الثالث، ص٤٧.

بەشێکی کەمی لە دنیادایە و ئەویتری لە قیامەتـە، بۆیـە کـۆدەنگیی هەیـە لەسـەر ئەوەی کە پاراستنی ئەم بنچینانە مەبەستی هـەموو ئایینـە ئاسمانییەکانـە[1] نـەك هەر تەنها ئایینی ئیسلام.

دوای ئەم بنچینە بنەڕەتییانە ئینجا پێویستییەکان (الحاجیات) دێـن، ئەمانـە گرنگییـان کـەمترە لەوانـەی پێـشوو، نموونـەی پێویـستییەکانش: ژنوژنخـوازی، بازرگـانی، هۆکارەکـانی گواسـتنەوە، ئیـسلام هـانی بەدەمەوەچـوونی ئـەم پێویـستییانە دەدات و کاروباریـان بـۆ ڕێکـدەخات، بـەڵام بـەدی نـەهێنانی ئـەم پێویـستییانە پەیوەنـدی نییـە بـە ژیـان و مردنـەوە، بەتایبـەتی لەسـەر ئاسـتی تاکەکەس، واتە ئەگەر کۆمەڵێك کەس بڕیاریاندا ژن نەهێنن یان شوو نەکەن ژیـانی مرۆڤایەتی ناکەوێتە بەر هەڕەشە، هـەروەها ئەگـەر کەسـانێك بازرگانییـان نـەکرد، بـەڵام ئەگـەر هـەرکام لـەم پێویـستییانە هـیچ کەسـێك پێـی هەڵنەسـتا لـەناو کۆمەڵگایەك یان کۆمەڵێکی بـەرفراوانی خەڵکیـدا، ئـەوا لـە ئاسـتی پێویـستییەکان دەردەچێت و دەچێتە بازنەی پێویستییە بنەڕەتییەکانەوە، بۆیە ئەم یاسا فیقهیـە دانراوە کە دەڵێ: "پێویستی (الحاجة) ئەگەر بوو بـە هـی هـەموان ئـەوا دەچـێتە بازنەی زۆر پێویستەکانەوە (الضروریات)"، واتە ئەگەر هەر پێویستییەکی ئاسـایی گشتێنرا بـۆ کۆمـەڵێکی زۆر، ئـەوا دەبێـە پێویـستی گـرنگ و دەبێـت بەوشـێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

بەڵام بە باش زانراوەکان (التحسینیات) ئەوا شتانێکن کە ژیـان جـوان دەکـەن، وەکو بۆنی خۆش و جلی جوان و سـەرنجڕاکێش و مـاڵ و خـانووی خـۆش، ئەمانـە ئیسلام هانی دەستخستنیان دەدات، بە نیشانە و دیاردەی بەخـشندەیی خـوا بـۆ بەندەکانی و سۆز و بەزەیی بێ پایانی بۆیـان دادەنرێـت، بـەڵام ئیـسلام دەیـەوێت

١ . الشاطبـي، الموافقات، المجلد الثالث، ص٥.

مسوڵمان ئەم شتانە نەکاتە مەبەست و گرنگیی زۆرتریان پێنەدات لە ژیانیدا، بەڵکو گرنگیی بۆ ئەو بابەتانەیە کە باسکران.

بەڵام هاوپەیوەستی و پەیوەندی هاوبەش لەنێوان ئەم کۆمەڵە جیاوازانەی مەبەستەکاندا هەیە، هەروەکو ئیمامی شاتبی ئەوەی تێبینی کردووە (کە دواتر گرنگیی زۆر بەو ئیمامە دەدەین)[1]، بۆ نموونە ژنخوازیی و بازرگانی کە لە کۆمەڵەی دووەمن (الحاجيات) دەبنەهۆی پاراستنی وەچە و ماڵ، پەیوەندییەکی بەهێزیان هەیە لەگەڵ ئەم دووانەدا کە لە کۆمەڵەی یەکەمن (الضروريات)، بەمشێوەیە نموونە زۆرە.

لەبەر ئەمە کەموکورتییەکی زۆر لە هەر یەکێك لە داواکراوەکاندا ئەو داواکراوە بەرزدەکاتەوە بۆ پلەیەکی بەرزتر، ئەگەر بازرگانی پەکیکەوت لە پانتاییەکی بەرفراواندا هەر وەکو ئەوەی لە تەنگژە ئابووریەکاندا ڕوودەدات، ئەوا ئەم بارە بازرگانی لە پلەی پێویستییەکانەوە دەگوازێتەوە بۆ پلەی پێویستییە بنەڕەتییەکان، هەر وەکو باسکرا. بۆیە شەرعزانان وا سەیری پێویستییەکان دەکەن کە کۆمەڵێك بازنەی بەیەکداچوون بە دەربڕینی هاوچەرخ، نەك پلەبەندییەکی قووچەکی نەگۆڕ[2]، بۆ نموونە سەیری ئەم خشتەیە بکە:




---

١ . نفس المصدر، المجلد الأول، ص١٥١.

٢ . جمال الدين عطية، نحو تفعيل مقاصد الشريعة، عمّان، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ٢٠٠١، ص٤٥.

## پلەبەندی قووچەکی مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلامیی

## (بەپێی پێویستی)

پلەبەندیی بەپێی پێویستی دەمخاتەوە بیری قووچەکی (ئەبراهام ماسلۆ) کە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی بیستەمدا نەخشەی کێشابوو، تیایدا بەرژەوەندی و پاڵنەرە ئینسانییەکان (نەك خواییەکان)ی ڕێکخستبوو، ناوینابوو (پەیژەی پێویستییەکان)[1]، بەپێی تێڕوانینی ماسلۆ پێویستییەکانی مرۆڤ جۆراوجۆرن لەنێوان پێویستییە لاشەییەکاندا سەرەڕای پێویستی ئاسایش، دواتر پێویستی بە خۆشەویسستی و ڕێز، لەکۆتاییدا "سەلماندنی خود"، لە ساڵی ١٩٤٧دا ماسلۆ پێنج ئاستی لە پێویستی پێشنیار کرد، دواتر لەساڵی ١٩٧٠دا سەرلەنوێ بە بۆچوونەکانیدا چووەوە، قووچەکێکی پێشنیار کرد لە (حەوت) ئاستی پێویستی[2]، ئەم لەیەکچوونەش لە نێوان شاتبی و تیۆری ماسلۆدا لەڕووی ئاستی ئامانجەکانەوە جێگای سەرنجە.

قووچەکی ماسلۆ لەشێوە گۆڕاوەکەیدا لە تیۆری (مەبەستەکان)ی ئیسلامیی دەچێت، لەو ڕووەوە کە ملکەچی گۆڕانکارییەکانە بە تێپەڕینی کات، تیۆری مەبەستەکانی ئیسلامیی گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە بە درێژایی سەردەمەکان، بەتایبەتی لەسەدەی بیستەمدا، لەم ڕووەوە زانایانی ئوسوڵی هاوچەرخ ڕەخنەی زۆریان لەو دابەشکردنە تەقلیدییە بۆ زۆرێك لە پێویستییەکان گرتووە کە باسمان کرد، پاساوی ڕەخنەکانیشیان زۆرە، ئەمانە هەندێکیان[3]:

---

[1] . أبراهام ماسلو، نظرية في الدوافع الإنسانية، Psychological Review، عدد٥٠(١٩٤٣): ٥٠، صفحات ٣٧٠-٩٦.

[2] . إيه إتش ماسلو، الدوافع والشخصية، الطبعة الثانية، نيويورك، هاربر ورو، ١٩٧٠، ماسلو، نظرية الدافعية الإنسانية.

[3] . ئەمە بەپێی گفتوگۆیەك کە لەگەڵ شێخ حەسەن تورابیدا کراوە، گفتوگۆیەکی سەرزارەکیی، خەرتوم، سودان، ئۆگۆست، ٢٠٠٦.

١ ـ مەبەستەکان لە تیۆرە تەقلیدییەکەیدا شتە گشتییەکانی شەریعەتی ئیسلامیی دەگرێتەوە، کەمجار دەچێتە ناو بابەتە تایبەتییەکانی شەریعەتی ئیسلامییەوە، تیۆری تەقلیدی مەبەستەکان کە هێڵە گشتییەکانیمان باسکرد، وەڵامی زۆر لە پرسیارە وردەکان ناداتەوە، لە نموونەی ئەو پرسیارانەی کردمان لە پێشەوە کە بە (بۆچی) دەستیان پێدەکرد.

٢ ـ مەبەستەکان لە شێوە تەقلیدییەکەیدا لە تاکەکان دەدوێ تا خێزان و کۆمەڵگا و مرۆڤایەتی بەگشتی، هەر وەکو ئەوەی شەریعەتی ئیسلامیی تەنها گرنگیی بە ژیانی تاکەکەس و ماڵ و ناموسی بدات، دوور لە کۆمەڵگا و سامان و ئابووری و کەرامەتی ئەو کۆمەڵگایە، بەڵام لەڕاستیدا ئیسلام گرنگیی بە هەموو ئەمانە دەدات.

٣ ـ دابەشکردنی مەبەستەکان لە شێوە تەقلیدییەکەیدا ئەگەرچی پلەکانی پێویستییە بنەڕەتییەکانی باسکردووە، بەڵام ئەمانە گرنگترین بنەما گەورەکان لەخۆیان ناگرن، وەکو دادگەریی و ئازادیی هەڵسوکەوت.

٤ ـ هەڵێنجانی مەبەستەکان لە کەلەپووری فیقهی شەرعزانانەوە بووە نەك لە دەقە بنەڕەتییەکانی قورئان و سوننەتەوە، بۆیە کاتێك باسی مەبەستەکان بەشێوە تەقلیدییەکەی دەخوێنینەوە، دەبینین سەرچاوەکانیان هەمیشە حوکمەکانی فیقهی ئیسلامیین، بە هەموو ئایینزاکانەوە (المذاهب)، نابینین ئایەتێکی قورئان کرابێتە سەرچاوەی هەڵێنجان.

بۆیە زانایانی هاوچەرخ هەوڵیانداوە چارەسەری ئەو لایەنە کەموکورتییانە بکەن کە باسمان کرد، بە پێشنیارکردنی کۆمەڵێك چەمك و دابەشکردن کە پەیوەندیی نوێ بە مەبەستەکانی شەریعەت دەبەخشێت، بۆیە دەربارەی ئەو پانتاییەی کە حوکمە شەرعییەکان دەیگرێتەوە، زانایانی هاوچەرخ مەبەستەکانیان بەسەر (سێ) ئاستدا دابەش کردووە:

١ ـ مەبەستە گشتییەکان: ئەوانیش ئەو مەبەستانەن کە ڕەچاوی بوونیان کراوە لە هەموو بوارە گشتییەکانی شەریعەتدا، وەکو پێویستییە بنەڕەتییەکان (الضروريات) و پێویستییەکان (الحاجيات) کە پێشتر باسمان کردن، هەندێکیشیان دواتر گفتوگۆمان لەسەر کردن، وەکو دادگەریی کۆمەڵایەتی و جیهانیبوون و ئاسانکاری.

٢ ـ مەبەستە تایبەتییەکان: ئەو مەبەستانەن کە بوونیان لە هەموو بوارە تایبەتی و لقەکانی شەریعەتدا هەیە، وەکو پاراستنی بەرژەوەندی منداڵان لە یاساکانی تایبەت بە خێزاندا، دوورخستنەوەی تاوانباران لە ئەنجامدانی تاوان لەو یاسایانەی تایبەتن بە سزادانەوە، ڕێگری لە قۆرخکردن لە یاساکانی تایبەت بە ڕێککەوتنە داراییەکان.

٣ ـ مەبەستە لاوەکییەکان: ئەم مەبەستانە تایبەتن بە (هۆکار) یاخود (ئامانج) لە دەقێکی تایبەت یان حوکمێکی دیاریکراو، بۆ نموونە ئامانجی دەرخستنی ڕاستی کاتێك دەقێك ژمارەیەك شایەت فەرز ئەکا لە کێشەگەلێکی دیاریکراودا، یان وەکو ئامانجی ئاسانکاریی بۆ ڕۆژووەوان کاتێك دەقێك ڕێگا بە شکاندنی ڕۆژووەکەی ددەدات، یاخود ئامانجی پێدانی خواردن بە هەژاران لە چوارچێوەی حوکمی پێویستبوونی دابەشکردنی گۆشتی قوربانی لە ڕۆژانی جەژندا، یان نەهێشتنەوەی گۆشتی قوربانی و پاشەکەوت نەکردنی، بەمشێوەیە.

لەبەر ئەمە، لەپێناوی تەواوکردنی ئەو کەلێنانەی زانایانی هاوچەرخ تێبینییان کردوون لە بابەتی تێڕوانینی تاکەکەسی لە مەبەستەکاندا، هەوڵیانداوە بازنەی مەبەستەکان فراوان بکەن تا خێزان و کۆمەڵگا و مرۆڤایەتی بەگشتی بگرێتەوە، بۆ نموونە (ئیبن عاشور ـ پاش کەمێکیتر باسی دەکەین) دەگەڕێ بە دوای ئەو مەبەستانەدا کە هەموو ئوممەت دەگرنەوە، گرنگی و پێشەنگی دەدات بەو مەبەستانەی تاکەکەس تێدەپەڕێنن، هەروەها لەلای ڕەشید ڕەزا تیۆری مەبەستەکان (چاکسازیی) و (مافەکانی ئافرەت)یش دەگرێتەوە، بەڵام لای یوسف

قــەرزاوی تیـۆری مەبەسـتەکان (کەرامـەتی مـرۆڤ) و (مافـەکانی مـرۆڤ)یـش دەگرێتەخۆی.

ئـەم فراوانکردنانـە لـە ئاسـۆی مەبەسـتەکاندا بـواری کردووەتـەوە بـۆ وەڵامدانەوەی زۆرێك لە بابەت و پرسی هاوچەرخ لە مەبەستەکاندا، وایکـردووە کـە زانای شەرعزان لە "حیکمەت و نهێنی ئەودیوو حوکمەکان"ەوە دەست پێبکات بۆ ئەوەی کۆمەڵێك هێڵی پراکتیکی وێنا بکات بۆ چاکسازی و نوێکردنـەوە، هـەروەکو زانایان مەبەستەکانی شەریعەت و ئەو سیستمی بەهایانـەی لەسـەری دادەمـەزرێت کردووەتە تەوەری گفتوگۆکان دەربـارەی هـاووڵاتیبوون و تـەواوکاری و مافـەکانی مرۆڤ بۆ کەمینە مسوڵمانەکان لەو کۆمەڵگایانەی زۆرینەیان نامسوڵمانن.

لەکۆتاییدا زانایانی هاوچەرخ پێشنیاری کۆمەڵێك مەبەستی جیهانییان کـردووە کە لە دەقەکانەوە ڕاستەوخۆ هەڵیانهێنجاون، نەك لە کتێبە فیقهییەکانەوە کـە لـە ئاییـنزایـەکی ناسـراودا نووسـرابێت، لـە تایبەتمەندییـەکانی ئـەم ڕێگایـە ئەوەیـە کێشەی گۆڕانکاری سەردەمەکانی تێپەڕاندووە دەربارەی هەندێك فتوای فیقهی کە زانایـانی پێـشین هــەڵیان هێنجـاوە، ئـەم زاراوە نوێیانـە بـەها و بنـەما باڵاکـان بەرجەستە دەکەن، لێرەوە کۆمەڵێك نموونە دەربـارەی مەبەسـتە گـشتییەکان کـە ڕاستەوخۆ هەڵێنجراون لە دەقە ئیسلامییەکانەوە دەخەمە ڕوو:

(١) ڕەشـید ڕەزا (١٣٥٤ك ـ ١٩٣٥ز وەفـاتی کـردووە) هەسـتاوە بـە ڕانـان و خوێندنەوەی قورئان بۆ ئەوەی بزانێت چی تیایە لە مەبەستەکان، بینی کـەوا ئـەم بابەتانە دەگرێتـەوە: (چاکسازیی بنـەماکانی ئـایین، ئاشـکراکردنی ئـەوەی مـرۆڤ دەربـارەی پێغەمبەرایـەتی نـایزانێ، هـەروەها ئاشـکراکردنی ئـەوەی کـە ئیـسلام ئـایینی فـیترەت و ئـەقڵ و زانـست و دانـایی و بەڵگـە و ئـازادیی و سـەربەخۆییە، چاکسازی کۆمەڵایەتی و ئینسانی و سیاسی، ئەرکەکانی تاکەکەس لە بەندایـەتی و ڕێلێگیراوەکـان، پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان لـە ئیـسلامدا، چاکـسازی مـاڵ و

دارایی، ڕێگریی له خراپییەکانی جەنگ، پێدانی ماف بە ئافرەتان، ئازادکردنی گەردن لە بەندایەتی بۆ مرۆڤ[1].

(٢) ئیبن عاشور (١٣٢٥ك ـ ١٩٠٧ز) پێشنیاری ئەو بیرۆکەیەی کردووە کە مەبەستە جیهانیەکانی یاسادانانی ئیسلامیی بریتین لە چەسپاندنی (پاراستنی سیستمی ئوممەت، یەکسانی، ئازادی، لێبوردەیی، ڕەچاوکردنی فیترەت)[2]، ئەوەی کە تێبینی دەکرێت لەمەبەستی (ئیبن عاشور) و کۆمەڵێك لە زانایانی هاوچەرخدا دەربارەی ئازادیی جیاوازە لە مەبەستی (ئازادکردن) بە مانای ئازادکردنی بەندە وەکو ئەوەی لە قسەی شەرعزانانی کۆندا هاتووە[3]، بەڵام شەرعزانانی پێشوو زاراوەی (المشیئة ـ ویست)یان بەکارهێناوە کە لە چەمکی (ئازادی) و (ئیرادەی ئازاد) دەچێت لە چەند لایەنێکەوە، (ئازادیی بیروباوەڕ) بۆ نموونە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە (فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن ومَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُر)[4]، بەڵام وەکو زاراوە ئەوا وشەی (ئازادی) تازە هاتووەتە زاراوەی ئیسلامییەوە، ئەوەی جێگای باسە (ئیبن عاشور) هۆکاری بنیاتنانی چەمکی (ئازادی) وەکو مەبەستێکی شەریعەت ئەگێڕێتەوە بۆ "ئەو کتێبانەی کە باسیان لە شۆڕشی فەڕەنسی کردووە، ئەوانیش ئەو کتێبانەی لە فەڕەنسییەوە وەرگێڕراون بۆ عەرەبی لە سەدەی نۆزدەدا"[5] بەپێی قسەی ئەو، بەڵام ئیبنو عاشور قووڵبووەتەوە لە

---

[1] . محمد رشيد رضا، الوحي المحمدي، ثبوت النبوة بالقرآن، القاهرة، مؤسسة عزالدين، بدون تأريخ، ص١٠٠.

[2] . ابن عاشور، مقاصد الشريعة الإسلامية، ص١٨٣.

[3] . كما نجد مثلا في: كمال الدين السيواسي، شرح فتح القدير، ط٢، بيروت، دار الفكر، بدون تأريخ، المجلد الرابع،ص٥١٣.

[4] . سورة الكهف ، الآية٢٩.

[5] . محمد الطاهر ابن عاشور، أصول النظام الإجتماعي في الإسلام، تحرير محمد الطاهر الميساوي، عمان، دار النفائس، ٢٠٠١،ص٢٥٦، ٢٦٨.

شیکردنەوەی تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئازادیی بیرکردنەوە و بیروباوەڕ و دەربڕین و کارکردن وەکو بەشێك لە خودی مەبەستەکانی شەریعەت[1].

(٣) موحەممەد غەزالی (١٤١٦ك - ١٩٩٦ز وەفاتی کردووە) بانگەشەی وانەوەرگرتنی دەکرد لە ئەو چواردە سەدەیەی ڕابردوو لە مێژووی ئیسلامیی، لێرەوە هەردوو چەمکی (دادگەریی و ئازادیی) خستە ناو مەبەستەکانی شەریعەت لەسەر ئاستی پێویستییە بنەڕەتییەکان (الضروريات)[2]، دەکرێ بڵێین گرنگترین بەشداری شێخ غەزالی لە زانستی مەبەستەکاندا بریتی بووە لە ڕەخنەگرتن لەو ئاراستە حەرفیەی زۆرێك لە زانایان گرتوویانەتەبەر لەم ڕۆژگارەدا[3]، هەرکەسێك وردبێتەوە لە نووسینەکانی دەبینێ کەوا بیرەکانی لە بنچینەی مەبەستەکانی شەریعەت بنیات نراون، بۆ نموونە کاتێك باس لە یەکسانی و دادگەریی کۆمەڵایەتی دەکات، کە دوو بنچینەن، هەموو بیرو بۆچوونە نوێیەکانی تایبەت بە فیقهی ئافرەتانی لەسەر ئەمان دارشتووە، جگە لەمەش لە کۆمەڵێك بواری تردا.

(٤) هەروەها یوسف قەرزاوی (ساڵی ١٣٤٥ك - ١٩٢٦ز لە دایکبووە) هەستاوە بە ڕانانی قورئانی پیرۆز و گەیشتووەتە ئەم مەبەستە گشتییانە: "ڕاستکردنەوەی بیروباوەڕەکان دەربارەی خوایەتی (الألوهية) و پەیام و پاداشت، چەسپاندنی ماف و کەرامەتی ئینسان، بانگەواز بۆ بەندایەتی خوا، پاككردنەوەی نەفسی ئینسانی و ڕاستکردنەوەی ڕەوشت، و پێکهێنانی خێزانی بۆ خوا سوڵحاو و چاکە لەگەڵ ئافرەت، بنیاتنانی ئومەتی چاکەخواز بۆ مرۆڤایەتی، بانگەواز بۆ جیهانێکی مرۆڤدۆست و هاوکاری یەکتر"[4]، بەڵام یوسف قەرزاوی پێیوایە کە ناکرێ

---

[1] . نفس المصدر ، ص٢٧٠ — ٢٨١.

[2] . جمال عطية، نحو تفعيل مقاصد الشريعة، عمّان، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ٢٠٠١، ص٤٩.

[3] . موئل عزالدين، القانون الإسلامي: من الأصول التأريخية إلى الممارسة المعاصرة، تحرير: كارول هيلينبراد، إدنبرة، مطبعة جامعة إدنبرة المحدودة، ٢٠٠٤، صفحات ١٣١-١٣٢.

[4] . يوسف القرضاوي، كيف نتعامل مع القرآن الكريم، ط١، القاهرة دار الروق، ١٩٩٩.

تیۆرێکی گشتی پێشنیار بکرێت لە مەبەستەکاندا هەتاکو بڕی پێویست لە شارەزایی نەبێت لە زانست بە قورئان و سوننەت[1].

(٥) هەروەها تەها عەلوانی (ساڵی ١٣٥٤ك ـ ١٩٣٥ز لەدایك بووە) هەستاوە بە ڕانانی قورئانی پیرۆز بە هەمانشێوە بۆ ئەوەی مەبەستەکانی شەریعەت دیاری بکات "مەبەستە شەرعییە باڵا و سەروەرەکان" هەروەکو عەلوانی خۆی باسیان دەکات بریتین لە "یەکخواناسی و پاککردنەوەوی نەفس و ئاوەدانکردنەوە"[2]، ئێستاش عەلوانی خەریکی نووسینی کۆمەڵێك توێژینەوەی سەربەخۆیە بۆ هەر یەکێك لەو سێ مەبەستەی سەرەوە[3].

هەموو ئەم مەبەستانەی باسکران ئەوانەن کە لە بیر و زەینی زانایانی هاوچەرخدا هەن لە چەمکەکانی چاکسازی و نوێگەریی، هیچ کەسێك ناتوانێ بانگەشەی ئەوە بکات کە هەر یەکێك لەو دابەشکردنانەی باسکران بە کۆن و نوێ لە مەبەستەکان، کتومت ئەوانەن کە خوای گەورە دەیەوێ، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئەو سروشتەی کە خوای گەورە دروستی کردووە، ئەوا ئەو بازنە و هەرەم و لاکێشانە نابینین وەکو ئەوەی لە دواتردا دێن و بۆچوونی زانایان دەردەخەن بۆ دابەشکردنی مەبەستەکان، هەموو پێکهاتەیەك لە زانستەکان و زانستە مرۆڤایەتییەکانیشدا، هەموو ئەو بەشانەش کە لێیان پێك دێن دروستکراوی مرۆڤن، مرۆڤ خۆی پێویستی بەو ڕوونکردنەوانە هەیە لە پێناوی تێگەیشتن و ڕوونکردنەوەی شتەکان بۆخۆی.

---

[1] . محاورات شفهية، لندن، المملكة المتحدة، آذار ـ مارس، ٢٠٠٥، ساراييفو، البوسنة، أيار ـ مايو، ٢٠٠٧.

[2] . طه جابر العلواني، مقاصد الشريعة، ط١، بيروت، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ودار الهادي، ٢٠٠١، ص٢٥.

[3] . محاورة فهية، القاهرة، مصر، نيسان ـ إبريل، ٢٠٠٧.

لەبەر ئەوە زۆرترین شت کە بیڵێین دەربارەی مەبەستەکان ئەوەیە کە پێکهاتەیەکی فرەڕەهەندن، هەر یەکە لە ئاستەکانی پێویستی و بواری حوکمەکان و جۆری داوالێکراوان و بوارەکانی گشتاندن، بریتین لە چەند ڕەهەندێکی ڕاست کە زانای شەرعزان یەکێکیان لەبەرچاو دەگرێ بۆ تێڕوانین و لێیەوە دابەشکردنەکەی پێشنیار دەکات.

لە میانەی ئەو بیرو بۆچوونانەی لە سەدەی بیستەمدا دەرکەوتن و هەندێکیمان لە پێشەوە باسکرد، بۆمان ڕووندەبێتەوە مەبەستەکانی شەریعەت لەڕاستیدا تێڕوانینی زانای شەرعزانن پێشکەشیان دەکات لە میانەی هەوڵەکانی بۆ نوێکردنەوە و چاکسازیی ئیسلامییدا، ئەمە بێگومان بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی هەر یەکێك لەو مەبەستانە لە بنەڕەتدا هەڵێنجراوی دەقەکانی قورئان و سوننەتن، ئەم کۆکردنەوەیە لە نێوان قورئان و سوننەت و پێویستی سەردەمدا گرنگیی تایبەت دەبەخشێتە مەبەستەکان.









## مەبەستە شەرعییەکان لە هەڵێنجانی هاوەڵاندا

مێژووی گەڕان بە دوای هۆکارێك یان ئامانجێك یان مەبەستێکدا لە پشت فەرمانەکانی قورئان و سوننەتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێت)، ئەمەش لە بەدواداچوونی کۆمەڵێك ڕووداودا دەردەکەوێت، وەکو ئەو فەرمودە پیرۆزەی دەربارەی نوێژی عەسرە لە (بەنو قورەیزە)، کە بە چەند ڕێگایەك دەگێڕڕێتەوە، بڵاوە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمانیکرد بە هاوەڵانی کە بچن بۆ لای هۆزی (بەنو قورەیزە)[1] نوێژی عەسر نەکەن تا لەوێ دەیکەن[2]، کاتێك خەریکبوو کاتی نوێژ تەواو کۆتایی بێت و هێشتا هاوەڵان

---

[1] . نزیکەی ساڵی حەوتەمی کۆچی بوو، ئەو شوێنەش کە تیایدا بوون چەند میلێك لە مەدینە دووربوو.

[2] . محمد البخاري، الصحيح، تحرير: مصطفى البغا، ط٣، بيروت، دار ابن كثير، ١٩٨٦، ص٣٢١، وأبو الحسين مسلم، صحيح مسلم، تحرير: محمد فؤاد عبدالباقي، بيروت، دار إحياء التراث العربي، بدون تأريخ، المجلد الثالث، ص١٣٩١.

نەگەیشتبوونە (بەنو قورەیزە)، بۆیە دابەشبوون بۆ دوو ڕای جیاواز: بەشێکیان سووربوون لەسەر ئەوەی کە نوێژی عەسر نەکەن تا نەگەنە شوێنی دیاریکراو، ئەگەرچی کاتەکەشی بەسەر بچێت، بەڵام بەشێکی تریان نوێژیان کرد هەر لەو جێگایە، بۆ ئەوەی کاتەکەی بەسەر نەچێت.

بەڵگەی کۆمەڵی یەکەم ئەوەبوو دەیانووت: ڕاسپاردەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕوونە کە فەرمانی بە هەمووان کردووە نوێژی عەسر نەکەن تا دەگەنە بەنو قورەیزە، بەڵام بەڵگەی کۆمەڵی دووەم ئەوە بوو کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) (مەبەست)ی واتە نیەتی ئەوە بووە کاتێک ئەم فەرمانەی پێکردوون کە خێرابکەن و خۆیان نەخافڵێنن تا زوو بگەنە بەنی قورەیزە، مەبەستی ئەوە نەبووە نوێژ دوابخرێت، تا لەکاتی خۆی دەردەچێت، لێرەدا ڕاوی فەرموودەکە ئەوەشی زیادکردووە کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) سەرزەنشتی هیچ لایەکیانی نەکرد[1]، ئەمەش ـ وەکو لای شەرعزانان زانراوە ـ ئەوە دەگەیەنێت کە بێدەنگبوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە بەرامبەر کاری هەردوو کۆمەڵەکە واتە ڕێگادان بە هەردوو جۆرە تێگەیشتنەکە، بەڵام شەرعزانێکی گەورە لەم ڕازیبوونە لەهەردوو کۆمەڵەکە دەرچووە ئەویش (ئیبن حەزمی زاهیریی)ە، ئەو پێیوایە نەدەبووایە ئەو هاوەڵانەی لە ڕێگا نوێژیان کردووە بیانکردایە و ئارامیان بگرتایە تا دەگەیشتنە بەنی قورەیزە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمانی ئەوەی پێکردبوون، ئەگەر تەنانەت نوێژی عەسریان تا نیوەی شەو دوا بخستایە دەبووایە نەیانکردایە[2].

---

[1] . رواه عبدالله بن عمر، كما أخرجه البخاري، المجلد الأول، ص٣٢١، ومسلم، المجلد الثالث، ص١٣٩١.

[2] . علي ابن حزم، المحلّى، تحرير: لجنة إحياء التراث العربي، ط١، بيروت، دار الآفاق، بدون تأريخ، المجلد الثالث، ص٢٩١.

ڕووداوێکـیتر هەیـە تیایـدا ڕوونـتر تێگەیـشتنی مەبەسـتییانەی هـاوەڵان بـۆ فەرمانەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەردەکەوێت، ئەویش ئەوەیـە کە لەسەردەمی عومـەری کوڕی خەتتابـدا ڕوویـدا دەربـارەی ئـەو زەوییانـەی کـە فەتحکرابوون، پلەوپایەی عومەر (ڕەزای خوای لەسەر بێت) لەو کارەدا کە ڕاوێـژی بە ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵان کـرد، مانـا و نـاوەڕۆکێکی تایبـەت بـەو هەڵێنجانانـە دەبەخشێت کـە دەکـران، لـەم ڕووداوەدا کـە باسـی دەکـەین هـاوەڵان داوایـان لـە عومەر کرد ئەو زەوییانەیان بەسـەردا دابـەش بکـات کـە خرابوونـە سـەر دەوڵـەتی ئیسلامیی لە میسر و عێراق، بەو پێیـەی بەشـێکن لـە دەسـکەوتی شـەڕ (غنـائم)، بەڵگەشیان ئەوە بوو کە ئایەتی ڕوون و ئاشکرا و دیاریکراو هەیە فەرمان دەکـا بـە دابەشکردنی دەسکەوت بەسەر شەڕکەراندا[1]، بەڵام عومەر (دروودی خوای لەسـەر بێت) ڕەتیکردەوە شار و هەرێمەکان بە تەواوەتی بەسەر هاوەڵاندا دابـەش بکـات، لەمەشدا پشتی بە کۆمەڵێك ئایەت بەست وشەکانی مانای گشتیتر دەبەخشن، ئـەو ئایەتانەش کە پشتی پێبەستن ئەو مەبەستەی خوای گەورە ڕووندەکەنەوە (كَـيْ لاَ يَكونَ دُولَةً بَيْنَ الأغنِياءِ مِنْكُمْ)[2]، واتە بـۆ ئـەوەی دەوڵەمەنـدەکان مـاڵ و سـامان قۆرخ نەکەن، لەبەر ئەمـە عومـەر و لەگەڵیـشیدا کۆمـەڵێك هـاوەڵ کـە هـەمان ڕای ئـەویان هـەبوو، وا لـە ئایەتـەکانی دابەشـکردنی دەسـکەوت گەیـشتبوون بەسـەر جەنگاوەراندا کـە لـە سـیاقی مەبەسـتێکی دیـاریکراو لـە مەبەسـتە شـەرعییەکاندا هاتوون، ئەویش بریتییە لە: کەمکردنـەوەی مـەودای ئـابووری لـەنێوان چـینەکانی خەڵکدا بە دەربڕینی سەردەم.

---

[1] . يعقوب أبو يوسف، الخراج، القاهرة، المطبعة الأميرية، ١٣٠٣هـ، ص١٤، ٨١، ويحيى بن آدام، الخراج، لاهور، الباكستان، المكتبة العلمية، ١٩٧٤، ص١١٠.

[2] . القرآن الكريم، سورة الحشر، الآية ٧.

هەروەها نموونەیەکی تێگەیشتنی قووڵتر هەیە، ئەویش هەڵپەساردنی کارکردن بە سزای دزیکردن لەلایەن عومەرەوە لە ساڵی گرانییەکەدا لە مەدینە[1]، لەبەر ئەوەی واتێگەیشتبوو جێبەجێکردنی ئەم سزایە کە قورئانی پیرۆز فەرزی کردووە، لەکاتێکدا پێویستی خەڵکی گەیشتووەتە ئاستی لەناوچوون مەبەستی بنەڕەتی سزادان لە ئیسلامدا ناپێکێ، کە بریتییە لە دادگەریی، لەبەرئەوە عومەر وایدەبینی کە ئەم مەبەستە لەوە گەورەترە کە وازی لێبهێنرێ لەبەر خاتری جێبەجێکردنی ئەم حوکمە تایبەتییە.

نموونەی سێیەم لە شارەزایی عومەر ئەوەیە کە کارکردنی بە مانای ڕوون و ئاشکرای فەرموودەیەك ڕاگرت، ئەو فەرموودەیەی کە ڕێگا دەدات بە سەرباز لە کاتی شەڕدا دەست بەسەر شتومەکی سەربازی کوژراوی دوژمندا بگرێت بۆخۆی[2]، بەڵام عومەر بڕیاریدا کە تەنها پێنجیەکی ئەو دەسکەوتە بدرێت بەسەربازەکان ئەمە لەکاتێکدا کە دەسکەوتەکان بە بەها و نرخ بەرزبن، ئەمەشی بۆ ئەوە بوو کە دادگەریی و ئینساف لە نێوان سەربازەکاندا پەیڕەو بکات و ماڵی گشتیش بۆ ئوممەت زیاد بکات بۆ کاتی پێویست.

با نموونەی چوارەمیش لە شارەزایی عومەر باس بکەین بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مانا، ئەویش بڕیاری عومەر بوو بەوەی کە ئەو ماڵەی زەکاتی لێدەکەوێ (ئەسپ)یش بگرێتەوە، ئەمە لەکاتێکدابوو کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەسپی هەڵاواردبوو لە زەکاتدان لە فەرموودەیەکی ڕووندا، بەڵام بەڵگەی عومەر ئەوەبوو لەو سەردەمەدا نرخی ئەسپ زۆر بەرز بووبووەوە لەچاو نرخی حوشتردا، کە حوشتر لەو شتانەبوو کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر

---

[1] . محمد بلتاجي، منهج عمر بن الخطاب في التشريع، ط١، القاهرة، دار السلام، ٢٠٠٢، ص١٩٠.

[2] . الوليد بن رشد، بداية المجتهد ونهاية المقتصد، بيروت، دار الفكر، بدون تأريخ، المجلد الأول، ص٢٩١.

بێت) خستبوونیە ناو ئەو ماڵ و سامانەی زەکاتیان لێ دەکەوێ[1]، بە واتایەکیتر عومەر وا لە مەبەستی زەکات تێگەیشتبوو کە جۆرێکە لە یارمەتی کۆمەڵایەتی بە دەربڕینی هاوچەرخ، دەوڵەمەندەکان دەیدەن بە هەژاران، ئەمە بە چاوپۆشی لە جۆری سامان و ئەو ماڵ و کاڵایانەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) باسیکردوون لە فەرموودەکانی زەکاتدا هەر ئەوانەی خەڵکی بە شێوەیەکی حەرفی جێبەجێیان دەکەن[2].

ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە هەموو مەزهەبە فیقهییەکان جگە لە مەزهەبی حەنەفی، دژی ئەم فراوانکردنەن لەو ماڵەی زەکات دەیگرێتەوە، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە تا چەند مەزهەبی (زاهیریی) لە تێگەیشتنی تەقلیدی فیقهدا هەبووە بەشێوەیەکی گشتی، ئەوە (ئیبن حەزم)ە لە هەموو شەرعزانان زاهیرییترە ئەمە دووپات دەکاتەوە: "زەکات تەنها لە هەشت جۆر ماڵ و سامانە، ئەوانیش ئاڵتوون و زیو و گەنم و جۆ و خورما و حوشتر و (مەڕ و بزن)... دەربارەی ئەمانەش فەرموودە هاتووە.... و زەکات لە هیچ شتێکی تر نییە، جگە لەوەی باسمان کرد لە بەروبووم و کشتوکاڵ و وڵاخ و بەندە و هەنگوین و بۆندی بازرگانیی...."[3]، ئەوەی کە ڕوونە لەم ڕایەدا ئەوەیە دەبینین تا چەند دەزگای زەکات پەك دەخات لەوەی ڕۆڵێکی بەرچاو ببینێت لە بەدیهێنانی دادگەریی و هاوتایی کۆمەڵایەتیدا کە ئەمانەش مەبەستی زەکاتن.

---

[1] . السواسي، كمال الدين، شرح فتح القدير، المجلد الثاني ص١٩٢، وأبو عمر بن عبد البر، التمهيد، تحرير: محمد الوالي ومحمد البكري، المغرب، وزارة عموم الوقف، ١٣٨٧، االمجلد الرابع، ص٢١٦.

[2] . يوسف القرضاوي، فقه الزكاة، رسالة دكتوراه، جامعة الأزهر، مصر، ط١٥، ١٩٨٥، المجلد الأول، ص٢٢٩.

[3] . علي بن حزم، المحلّى، تحرير: لجنة إحياء التراث العربي، ط١، بيروت، دار الآفاق، بدون تأريخ، المحلى، ص٢٠٩.

لەسـەر بنـەمای "تێڕوانینـی مەنهەجییانـەی بنـچینە شـاراوەكانی ئـەودیو حوكمـەكان"ەوە شـێخ یوسـف قـەرزاوی بەرامبـەری ڕای جمهـور دەوەسـتێتەوە دەربـارەی (توورەكـەی زەكـات) ئـەو ماڵـەی زەكـات دەیگرێتـەوە، لەمیانـەی ڕوونكردنەوەی ئەم بابەتە لە كتێبە بەپێزەكەیدا (فقه الزكاة)، ئـەو دەنووسێت: "هـەموو مـاڵێكی گەشـەكردوو زەكـات دەیگرێتـەوە ...... زەكـات تـەنها بـۆ بەدیهێنانی چەند شتێك پێویستكراوە، دابینكردنی پێویستی هەژاران و قـەرزاران و ڕێبوار و بەجێهێنانی بەرژەوەندی گشتی مسوڵمانان وەكو جیهاد لە پێناو خـوادا و دڵڕاگرتنی ئەوانەی تـازە دێنـە نـاو ئیـسلامەوە..... زۆر دوورە یاسـادانەر (خـوای گەورە) مەبەستی لە زەكات قورسكردنی بـاری سەرشـانی كەسێك بێـت كـە تـەنها پێنج حوشتری هەیە، یان چل سەر حەیوانی هەیە، یـاخود پێـنج بـار جـۆی هەیـە، بەڵام گەورە سەرمایەداران عـەفوبكات كـە گـەورەترین كارگـە و بـەرزترین تـەلاری بازرگانی هەبێت، یاخود پزیشك و پارێزەر و فەرمانبەری گەورە و خـاوەن پیـشەی ئازاد، ئەوانەی لە تەنها ڕۆژێكدا ئەوەندەی چەند ساڵێكی خاوەن پێنج حوشتر یان پێنج بار جۆیەكەیان دەست دەكەوێت[1].

بێگومـان نموونـەی زۆرمـان باسـكرد بـۆ ڕوونكردنـەوەی مەبەسـتەكەمان، كـە بریتیبـوو لـە ڕانـان و باسـكردنی گـۆڕان و پێـشكەوتنی تیـۆری مەبەسـتەكان، وە ئەوەی مانای دانانی مەبەستەكان وەكو چـەند بنـچینەیەكی نـەگۆڕ، بـەڵام ئـەوەی گرنگە ئاگامان لێیبێت ئەوەیـە بنـەمای لەبەرچـاوگرتنی مەبەسـتەكان و بنیاتنـانی حـوكمی شـەرعی لەسـەریان هـەموو حوكمـە شـەرعییەكان ناگرێتـەوە بەتایبـەتی "عیبادەتەكان".

بوخاری لە عومەرەوە دەگێڕێتەوە لەسـەردەمی خیلافـەتی خۆیدا وتوویـەتی: "ئەی ڕاكردنی نێوان سەفا و مەروە و شـان ڕووتكـردن بۆچییە؟ لـەكاتێكا خـوای

---

[1] . القرضاوي ، فقه الزكاة، المجلد الأول، ص١٤٦-١٤٨.

گەورە ئیسلامی سەربەرز كردووە و كوفر و هەڵگرانیشی سەرشۆڕ" بەم قسەیەی ئاماژەی كردووە بە حیكمەتی ئەو ڕاكردن و شان ڕووتكردنە كە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمانی بە مسوڵمانان كردووە لەكاتی فەتحی مەككەدا بۆ ئەوەی هێز و توانای مسوڵمانان بسەلمێنێت، چونكە بێبڕواكان وایان بڵاوكردبووەوە كە مسوڵمانان لە مەدینە تووشی نەخۆشی بوون و بێهێزبوون، بەڵام عومەر دواتر دەڵێت: "هیچ شتێك واز لێناهێنین كە لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێت) كردوومانە"[1]، بەم شێوەیە عومەر جیاوازی كردووە لەنێوان عیبادەت و هەڵسوكەوتەكاندا، (مەبەستی ئیمامی عومەر ئەوەبووە ئەو شان ڕووتكردن و ڕاكردنە لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێت) بۆ ئەوەبووە دەمكووتی كافرەكانی پێبكات كە وتوویانە مسوڵمانان بێهێز و لاواز بوون، ئێستا ئێمە بەهێزین و كافران لاوازبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەركی ناكەین و هەر ئەنجامی دەدەین مادام بەندایەتی و عیبادەتە ـ وەرگێڕ).

كاتێك ئیمامی شاتبی هات جیاوازی كرد لە نێوان ئەو دوو بابەتەدا، كاتێك وتی: "بنەڕەتی عیبادەت بریتییە لە بەندایەتیكردن بەبێ لاكردنەوە لە ماناكەی، ئەسڵ تیایدا ئەوەیە ئەنجام نەدرێ تا ڕێگای پێنەدرێ، چونكە عەقڵ بواری داهێنانی عیبادەتی نییە، بەڵام بنچینە لە هەڵسوكەوتەكاندا ئەوەیە بۆ ماناكەی بڕوانی، ئەسڵیش تێیدا ڕێگەدانە مەگەر بەڵگەیەك دژی بێت"[2]، لەمەوە ڕێسا گشتییەكە ئەوەیە عیبادەت دەبێت بە نەگۆڕی بمێنێتەوە، مسوڵمان ئەنجامی بدات وەكو چۆن پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) و هاوەڵانی كردوویانە، بەڵام ئەوان فێرمان دەكەن كە بەشێوەیەكی حەرفی چاویان لێ نەكەین لە هەڵسوكەوتەكاندا، بەڵكو مەبەستەكان لەبەرچاو بگرین لە جێبەجێكردنیاندا.

---

١. البخاري، الصحيح، كتاب الحج، باب الرمل.

٢. الشاطبي، الموافقات، المجلد الثاني، ص٦.

## تیۆره سەرەتاكان دەربارەی مەبەستەكان

تیۆری مەبەستەكان و دابەشكردنیان لە دوای سەردەمی هاوەڵانەوە دەستیكرد بە گەشەكردن، بەڵام مەبەستەكان بەمشێوەیەی ئێستا دەیبینین گەڵاڵە نەبوو تا زانایانی ئوصولّی ئەم دواییە دەركەوتن، واتە لەسەدەكانی پێنج تا هەشتی كۆچی، ئەمە لە بڕگەكانی دواییدا ڕووندەكەینەوە، بەڵام دەبێ ئەوە بڵێین كە لە سێ سەدەكانی یەكەمدا بیرۆكەی مەبەستەكان هەبووە (هەرچەندە پێیان وتراوە حیكمەتەكان، یان هۆكارەكان، یان بۆنە یاخود مانا لای ئوسولّییەكان لە ئایینزا فیقهییەكاندا)، بە نموونە هەڵێنجانی حوكمەكان لەڕێگای پێوان (قیاس)ەوە بە هەموو جۆرەكانیەوە، یان (استحسان) یاخود (لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی ـ المصالح)، بەڵام خودی مەبەستەكانی شەریعەت وەكو بابەتێكی سەربەخۆ دەرنەكەوت كە توێژینەوەی سەربەخۆی بۆ بكرێت، یان سەرنجی تایبەتی لێبدرێ، تا كۆتاییەكانی سەدەی سێیەمی كۆچی، دواتر تیۆری (پلەكانی پێویستی ــ درجات الضرورة) دەركەوت لای ئیمامی (جوەینی ـ ساڵی ٤٧٨ك وەفاتیكردووە)، لەكاتێكی درەنگدا، واتە لەسەدەی پێنجەمی كۆچیدا، ئێستاش با بە كورتی هەوڵە سەرەتاكانی گەشەكردنی تیۆری مەبەستەكان لە نێوان سەدەكانی سێیەم و پێنجەمدا بخەینەڕوو.

(١) (الترمذي الحكيم ـ ساڵی ٢٩٦ك ـ ٩٠٨ز وەفاتی كردووە): كتێبی تیرمزی دانا "نوێژ و مەبەستەكانی"[(١)] یەكەم كتێبی ناسراوە تەرخانكرابێت بۆ مەبەستەكان، لە ناونیشانی كتێبەكەدا وەك دیارە وشەی "مەبەستەكان" هاتووە، ئەم كتێبە حیكمەت و نهێنییە ڕوحییەكانی هەموو هەڵسوكەوتەكانی نوێژ ڕووندەكاتەوە، بە ئاڕاستەیەكی سۆفییانە كە ڕوون و ئاشكرایە، بۆ نموونە كە

[١] . كما قال أحمد الريسوني، نظرية المقاصد عند الإمام الشاطبي، ط١، هيرندن، فيرجينيا، المعهد العالمي للفكرالإسلامي، ١٩٩٢.

دەڵێ: "**هەڵسوکەوتە جۆراوجۆرەکانی نوێژ بە جیاوازی حاڵی بەندە: بە وەستانی ناو نوێژ لەڕاکردن دەردەچێت، بەڕووکردنە قیبلە لە پشتهەڵکردن و سەرپێچی دەردەچێت، بە (الله أكبر) لە فیز و لەخۆباییبوون دەردەچێت، بە سوپاسگوزاریی لە بێئاگایی ڕزگاری دەبێت، بە ڕکوع لە وشکی ڕزگاری دەبێت، بە سوجدەبردن لە تاوان ڕزگاری دەبێت، ......"، هەروەها تیرمزی دانا کتێبێکی تری هاوشێوەی هەیە دەربارەی حەجکردن ناویناوە "حەج و نهێنییەکانی"**[1].

**(٢) ئەبو زەیدی بەڵخی (ساڵی ٣٢٢ك ـ ٩٣٣ز وەفاتی کردووە): کتێبی ئەبو زەیدی بەلخی "ڕوونکردنەوەی هۆکارەکانی ئاییندارییی ـ الإبانة عن علل الديانة) یەکەم کتێبی ناسراوە دەربارەی مەبەستەکان لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا، تیایدا مەبەستە شاراوەکانی ئەودیو حوکمە شەرعییەکانی ڕوونکردووەتەوە، هەروەها بەلخی کتێبێکی تری نووسیوە لە مەبەستەکان ناویناوە "مصالح الأبدان والنفوس"، تیایدا ڕوونیکردووەتەوە چۆن هەڵسوکەوتی ئیسلامییانە و حوکمە ئیسلامییەکان دەبنە هۆی باشکردنی تەندروستی، جا تەندروستی لاشە بێت یان دەروونی**[2].

**(٣) (القفّال الكبير الشاشي ـ ساڵی ٣٦٥ك ـ ٩٧٥ز ووەفاتی کردووە) کۆنترین دەستنووس دەربارەی مەبەستەکان بینیبێتم کتێبی (القفال)ە بە ناونیشانی "محاسن الشريعة"**[3]**، ئەلقەفال کتێبەکەی بە پێشەکییەك دەست پێدەکات کە**

---

[1] . وذلك بحسب أحمد الريسوني، في: مقاصد الشريعة الإسلامية : دراسات في قضايا المنهج ومجالات التطبيق، تحرير: محمد سليم العوا، القاهرة، مؤسسة الفرقان للتراث الإسلامي، مركز دراسات المقاصد، ٢٠٠٦، ص١٨١.

[2] . محمد كمال إمام، الدليل الإرشادي إلى مقاصد الشريعة الإسلامية، لندن، مركز دراسات المقاصد، ٢٠٠٧، المقدمة، ص٣.

[3] . علمت عن هذا الكتاب من البروفيسور أحمد الريسوني في محاورة شفهية في جدة، نيسان/إبريل، ٢٠٠٦، وحصلت على ميكروفيلم عن المخطوط بمساعدة الأستاذ الدكتور أيمن فؤاد، بجامعة القاهرة،

نزیکــەی بیــست لاپــەڕە دەبێــت، دواتــر کتێبەکــە دابەشــدەکات بــە شــێوە تەقلیدییەکەی کتێبە فیقهییــەکان، ســەرەتا بــە پــاکێتی (الطهــارة) و دەســتنوێژ و نوێژ، تا کۆتایی بەشە تەقلیدییەکان، سەرەتا حوکمەکە بە گوشراوی باس دەکات دواتر ڕاڤەی مەبەستەکانی ئەو حوکمە دەکات لەگەڵ باسکردنی نهێنی و حیکمەتی شاراوە تیایدا، دەستنووسەکە تاڕادەیەك ڕوونــە و نزیکــە (٤٠٠) پــەڕە دەبێــت، لــە کۆتاییەکەیــدا مێــژووی تــەواوبوونی کتێبەکــە هەیــە، ئــەویش (١١ی ربیــع الأول–ی ساڵی ٣٥٨ی کۆچییە) کــە دەکاتــە (٧ی کــانوونی دووەمــی ٩٦٩ی زایینــی)، ئــەو حوکمانــەی کتێبەکــە دەیانگرێتــەوە زۆرن، بــەڵام ئــەو یــەك یــەك حوکمــەکان وەردەگرێت، بەجیا بەبێ ئــەوەی بەیەکیانــەوە ببەســتێت بــە تیــۆرێکی گــشتی لــە مەبەستەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کتێبەکە زیادکردنێکی گرنگــە لــە پێــشکەوتنی تیۆری مەبەستەکاندا.

(عبدالناصر اللّغاني) بەشێکی لە کتێبێکی تــری (القفــال) پێــشکەش کــردووە و لێی کۆڵیوەتەوە بە ناونیشانی "محاسن الشرائع"، ئەمەش تێزی دکتۆراکەی بــووە کە پێشکەشی زانکۆی (وێڵز)ی کــردووە لــە شانــشینی یــەکگرتووی بریتانیــا ســاڵی ٢٠٠٤[1]، (موئل عزالدین) سەرپــەرشتیاری تێزەکە دەربارەی گرنگی دەستنووسەکە و بەشداریی (الشاشي) لە گەڵاڵەکردنی تیۆرەکانی فیقهی ئیسلامیی، دەڵێت:

گرنگیــی فەرمانــە شــەرعییەکان وەکــو (الــشاشي) دەڵێــت، دەگەڕێتــەوە بــۆ ماناکانیان ، کە زۆرجار یاسادانەر جەختیان لەســەر دەکاتــەوە، نموونــەی ئەمــەش حەرامکردنی (مەی)ە، چونکە شەرع بەو شێوەیە سەیری هۆشبەرەکان دەکات کــە ڕێگایەکن بۆ ئەوەی شــەیتان لێیانــەوە دوژمنایــەتی لــە نــاو خەڵکدا بڵاوبکاتــەوە،

---

تموز/يوليه، ٢٠٠٦، والقفال الشاشي، محاسن الشريعة، مخطوطة في الفقه الـشافعي، رقـم٢٣٦، القـاهرة، دار الكتب، ٣٥٨هـ/٩٦٩م.

[1] . اللغاني، عبدالناصر، دراسة نقدية وتحرير الجزء الأول من كتـاب محاسـن الـشريعة للقفـال الـشاشي، رسالة دكتوراه، جامعة ويلز، ٢٠٠٤.

واشیان لێدەكات زیكری خوا و نوێژیان بیربچێتەوە.... خەریكە شاشی بوارێك نەهێڵێتەوە بۆ گومان لەوەی كە هەنگاوێكیتر دەنێت بۆ دەوڵەمەند كردنی مەزهەبە شافیعییەكەی ئەویش بە باسكردنی كۆمەڵێكی زۆر لە تیۆری فیقهی بۆ دانانی هۆكاری فەرمانە شەرعییەكان[1].

بەمشێوەیە ئەو "مانا" و "هۆكارانە"ی (القفال الشاشي) دەیانكاتە بنچینەی تێگەیشتن، بە تێزێكی سەرەتا دادەنرێن لە تیۆری مەبەستەكاندا، ئەگەرچی ئەم تیۆرە وەكو لقێك لە مەزهەبی شافیعی گەشەیكردووە، گرنگە لێرەدا ئاماژە بەوە بكەین كە گەشەپێدانی شاشی بۆ چەمكەكانی پێویستییەكان و مەبەستەكانی سیاسەت و پلەبەندی بەبەهاكان (مرتبة المكرمات)، ڕێخۆشكەر بوون بۆ جوەینی و غەزالی لە مەزهەبی شافیعی و تیۆری مەبەستەكانی شەریعەتدا بەیەكەوە، ئەمەش لە ڕێگای پەرەپێدانی ئەو چەمكانەی باسمان كردن و دواتریش لێیان دەدوێین.

(٤) ئیبنو بابۆی قومی (ساڵی ٣٨١ك - ٩٩١ز وەفاتی كردووە) هەندێك پێیانوایە گەڕان بەدوای مەبەستەكانی شەریعەتدا تایبەتبووە بە مەزهەبە فیقهییە سوننییەكان تا سەدەی بیستەم[2]، بەڵام لە ڕاستیدا یەكەم توێژینەوەی تێر و تەواو تایبەت كرابێت بە مەبەستەكان (ابن بابویه الصدوق القمي) نووسیویەتی، ئەویش شەرعزانێكی گەورەی شیعە بووە لە سەدەی چواری كۆچیدا، كتێبێكی نووسی لە (٣٣٥) بەش پێكهاتووە دەربارەی ئەم بابەتە[3]، ناونیشانی كتێبەكە

---

١ . عزالدين، أصول التشريع الإسلامي، ص١٠٦.

٢ . حسن جابر ، المقاصد في المدرسة الشيعية، في مقاصد الشريعة الإسلامية: دراسات في قضايا المنهج ومجالات التطبيق، تحرير: محمد سليم العوا، دراسات في فلسفة التشريع الإسلامي، النظرية والتطبيق، ط١، القاهرة، مؤسسة الفرقان للتراث الإسلامي، مركز دراسات المقاصد، ٢٠٠٦، ص٣٢٥، وكذلك: محاورة شفهية حول الموضوع في الإسكندرية، مصر، آب/اغسطس، ٢٠٠٦.

٣ . كما قال الأستاذ الدكتور محمد كمال إمام، من كلية الحقوق بجامعة الإسكندرية، محاورة شفهية، القاهرة، مصر، آب/اغسطس، ٢٠٠٦.

"علل الشريعة ـ هۆكارەكانی شەریعەت"ە تەفسیرێكی عەقڵی بڕوابوون بە خوا و پێغەمبەران و غەیب و هەموو بیر و باوەڕەكانیتر دەكات، هەروەكو چۆن باسی هۆكاری شاراوەی پشت نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەكات و خێر و چاكە لەگەڵ دایك و باوك و كاری تری واجب دەكات لەسەر ئینسان[1].

(٥) عامریی فەیلەسوف (ساڵی ٣٨١ك ـ ٩٩١ز وەفاتی كردووە): یەكەم كتێبی ناسراو دەربارەی دابەشكردنی مەبەستەكانی شەریعەت وەكو ئەوەی ئەمڕۆ ناسراوە، عامریی فەیلەسوف كردوویەتی، لە كتێبەكەیدا "الإعلام بمناقب الإسلام ـ باسكردنی سەروەرییەكانی ئیسلام" نووسیویەتی دەربارەی "ڕێگرتن لە كوشتنی نەفس .... ڕێگرتن لە بردنی ماڵ.... ڕێگرتن لە پەردەلادان لەسەر نهێنی... ڕێگرتن لە عەیبداركردنی ئابڕوو... ڕێگرتن لە وازهێنان لە دین..." بەڵام دابەشكردنی عامریی تایبەتە بە سزای تاوانەكان بەتایبەتی "حەدە شەرعییەكان" لە ئیسلامدا.

بەمشێوەیە دابەشكردنی مەبەستەكان بەپێی پلەكانی پێویستی گەشەی نەكرد تا سەدەی پێنجەمی كۆچی، دواتر تیۆری مەبەستەكان گەیشتە لوتكەی پێگەیشتن لەسەدەی هەشتەمی كۆچیدا (ئەمە ئەگەر ئەو پێشكەوتنە ڕیزپەڕ بكەین كە لەسەدەی بیستەمی زایینیدا ڕوویدا).

---

[1] . ابن بابويه الصدوق القمي، علل الشريعة، تحرير: محمد صادق بحر العلوم، النجف، دار البلاغة، ١٩٦٦.

# بەشی دووەم:
# پێشەنگەکانی مەبەستەکان
# لەسەدەی پێنجەم تا هەشتەمی کۆچی

سەدەی پێنجەمی کۆچی لەدایکبوونی "فەلسەفی یاسادانانی ئیسلامیی"ی بەخۆیەوە بینی، هەروەکو (عبدالله بن بیّە) ناوی دەنێت[1]، بە هاتنی ئەو سەردەمە دەرکەوت کە شێوازە حەرفییەکان و وەستان لەسەر ڕووکاری فتواکان کە پێشتر باوبوو، بەس نییە بۆ وەڵامدانەوەی پرسی هەڵسوکەوتەکان لەو شارستانییە چڕ و بەگرێ و گۆڵەی ئومەت لەو سەردەمەدا پێی گەیشتبوو، بۆیە وەك وەڵامدانەوە بۆ پێویستی نوێ تیۆری (بەرژەوەندییە ڕەهاکراوەکان - المصالح المرسلة) دەرکەوت، ئەوانیش ئەو بەرژەوەندی و سودانەن کە پێوستی نوێ پێیان دەرکەوتووە و شەرعزان نە لە قورئان و نە لە سوننەتدا باسکردنێکی ڕاستەخۆیان بۆ نادۆزێتەوە، ئەم تیۆرە ئەو بۆشاییەی پڕکردەوە کە تیۆرە حەرفییە تەقلیدییەکانی پێشوو بەجێیان هێشتبوو، دواتر بووە هۆی سەرهەڵدانی تیۆری مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلامیی، ئەو زانایانەی بەشدارییەکی بەرچاو و گرنگیان هەبوو لە گەشەپێدانی تیۆری مەبەستەکان لە نێوان سەدەکانی پێنجەم تا هەشتەمی کۆچی، ئەمانە بوون: (أبو المعالي الجويني، وأبو حامد الغزالي، والعز بن عبدالسلام، وشهاب الدين القرافي، شمس الدين ابن القيم) و دیارترینیان لەم بوارەدا (أبو إسحاق الشاطبي)ە.

---

[1] . محاورة شفهية مع الشيخ عبدالله بن بيّه في مكّة، نيسان/إبريل، ٢٠٠٦.

## ئیمامی جوەینی و پێویستییە گشتییەکان

ئـەبو مـەعالی جـوەینی (سـاڵی ٤٧٨ك ـ ١٠٨٥ز وەفـاتی کـردووە) کتێبەکـەی (البرهان في أصول الفقه)ی نووسی، یەکەم کتێب بوو تیـۆری (پلـەکانی پێویـستی) پێشکەش کرد بـە شـێوەیەکی نزیـك لـەوەی ئـەمڕۆ هەیـە دەربـارەی ئـەو تیـۆرە، جـوەینی پێـشنیاری پێـنج ئاسـتی کـرد بەمـشێوەیە: "بەشـی یەکـەم: ئـەوەی پەیوەندی بە پێویستییەکانەوە هەیە وەکو تۆڵە سەندنەوە. بەشی دووەم: ئەوەی پەیوەندی بە پێویـستییە گـشتییەکانەوە هەیـە وەکـو بـەکرێگرتن لـەناو خەڵکدا. بەشـی سـێیەم: دەربـارەی خۆڕازاندنـەوە بـە شـتە باشـەکان و دوورکەوتنـەوە لـە دژەکانیان وەکـو خۆپاککردنـەوەکان. بەشـی چـوارەم: تایبەتـە بـە (المنـدوبات). بەشـی پێنجـەم: ئـەوەی هۆکـارێکی دیـار و مەبەسـتێکی ڕوونـی نییـە، ئەمـەش کەمە..."[1].

لەو شتانەی پێشنیاری کردبوو لە مەبەستی یاسادانانی ئیسلامیی بریتیبـوو لـە "پاراستن"ی بیروباوەڕی خەڵکی و ڕوح و ئەقڵ و عەورەت و ماڵیان[2].

مـن وای دەبینـم ـ والله أعلـم ـ کتێبەکـەی تـری جـوەینی (غیـاث الأمـم) بەشدارییەکی گرنگی تری تیۆری مەبەستەکانی شـەریعەتە، ئەگەرچـی ئـەو کتێبـە باسی پرسگەلێکی سیاسەتی شـەرعی دەکات بەشـێوەیەکی سـەرەکی، وە تیایـدا ترسی خۆی دەردەبڕێ لەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان هەڵگرانی شەریعەت و گـوێزەرەوانی مەزهەبەکان نەمێنن، لە بەشی کۆتـایی کتێبەکەیـدا گریمانـەی ئـەوە دادەنێـت کـە ئەمە ڕوبدا، لەسەر بنەمای ئەم گریمانەیە حوکمەکانی شەریعەت بنیات دەنێـت لـە بابەتە فیقهییە جۆراوجۆرەکاندا لەسـەر"بنـەما کۆتاییـەکان ـ الأصـول القطعیـة" و

---

١. الجويني، عبدالملك، البرهان في أصول الفقه، تحرير: عبدالعظيم الديب، ط٤، المنصورة، الوفاء، ١٤١٨هـ /١٩٩٨م، المجلد الثاني، ص٦٢١، ٦٢٢، ٧٤٧.

٢. هەمان سەرچاوە.

ئـەو حوکمـە موحکەمانـەی نـە گریمانـە دژیەکـەکان و نـە ڕێگاکـانی تـەئویلکردن هـەڵناگرن، ئەمـە بـە دەربڕینــی ئــەو، دواتــر جـوەینی دەڵــێ ئــەو موحکەمانــە "مەبەستەکان"ن لە بابەتە فیقهییەکاندا، بۆ نموونە مەبەستی ڕازیبوونی هـەردوولا لە مامەڵەی کڕین و فرۆشتندا، هـەروەها مەبەسـتی لابردنـی زیـانی ئاتاجـەکان لـە زەکاتـدا، مەبەسـتی ئاسـانکاری لـە بەشـی (پیـسییەکان ـ النجاسـات)دا و جگـە لەمانەش[1]، کتێبی (غیاث الأمم)ی جوەینی بە بڕوای مـن تێزێکـی تێروتـەواوە بـۆ نوێکردنــەوە و ســەرلەنوێ داڕشــتنەوەی فیقهــی ئیــسلامیی لەســەر بنــەمای مەبەستەکان.

## ئیمامی غەزالی و "ڕێکخستنی پێویستییەکان"

ئـەبو حامیـدی غـەزالی (سـاڵی ٥٠٥ك ـ ١١١١ز وەفـاتی کـردووە) کـە قوتـابی جوەینی بووە، هەستا بە گەشـەپێدانی تیـۆری مامۆسـتاکەی، ئەمـە هـەروەکو لـە کتێبەکەیدا "المستصفی" دەردەکەوێت، پێویستییە بنەڕەتییـەکان کـە جـوەینی پێشکەشی کردبوون بەم شـێوەیە ڕێکـی خـستنەوە: ئـایین ئینجـا نـەفس، ئـەقڵ، وەچە، ماڵ[2]، غـەزالی خـۆی زاراوەی (پاراسـتن)ی داهێنـا لـە میانـەی قسەکانیدا دەربــارەی زۆر پێویــستەکان، بــەڵام لەگــەڵ شــیکردنەوەکانیدا غــەزالی هێــزی بەڵگـەبوونی ـ بـە مانـای ئوسـوڵییەکان ـ نـەداوە بـەهیچ یـەکێك لـە مەبەسـتەکان، بەڵکو ناوینـاون مەبەسـتە گریمانەییـەکان (المقاصـد الموهومـة)[3]، هـۆی ئەمـەش ئەوەیە ئەو مەبەستانە خوێنراونەتەوە و لە قورئانـەوە هـەڵێنجراون نـەك دەقێکـی

---

[1] . هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٤٤٦، ٤٧٣، ٤٩٤.

[2] . الغزالي، المستصفى، ص٢٥٨.

[3] . هەمان سەرچاوە، ١٧٢.

ڕاستەخۆیان لەسەر بێت، ئەمە بە پێچەوانەی بەڵگە شەرعییەکانی ترەوە کە بەڵگەیان لەسەرە.

لەگەڵ ئەوەشدا غەزالی مەبەستەکانی زۆر بە ڕوونی بەکارهێناوە وەکو بناغەیەك بۆ بنیاتنانی چەند حوکمێکی شەرعی، بۆ نموونە دەنووسێت: "دوای شاهیدی شەرع بەرژەوەندی سێ بەشە، بەشێکیان شەرع لەبەرچاویگرتووە، بەشێکیانی ڕەتکردووەتەوە، بەشێکیانی نە ڕەتکردووەتەوە و نە لەبەرچاویشی گرتووە، ئەوەی شەرع لەبەرچاوی گرتووە و شاهیدی بۆ داوە ئەوە دەبێتە بەڵگە، ئەنجامەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ (پێوان ـ قیاس) کە بریتییە لە وەرگرتنی حوکمی دەق و کۆدەنگیی (الإجماع).... نموونەی ئەمەش حوکمی ئەوەی هەر شتێك لە خواردن و خواردنەوە سەرخۆشکەر (هۆشبەر) بێت حەرام دەبێت، ئەمەش بە قیاسکردن لەسەر (مەی)، حەرامکراوە بۆ پاراستنی ئەقڵ چونکە ئەقڵ بنچینەی تەکلیفە،.... مەبەستی شەرعیش لە خەڵکیدا پێنج شتە: ئەوەیە دین و نەفس و ئەقڵ و وەچە وماڵیان بپارێزێت بە حوکمە شەرعییەکان، هەر شتێك ئەم پێنج بنەمایەی تیابێت ئەوا بەرژەوەندییە، بە پێچەوانەوە هەر شتێك ئەو پێنج بنەمایەی تیا بەرجەستە نەبێت ئەوا خراپەیە و لابردن و نەهێشتنی بەرژەوەندییە[1]، هەروەها غەزالی "یاسا"یەکی پێشنیار کردووە لەسەر بنچینەی پێویستییە بنەڕەتییەکان بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێ، ئەویش ئەوەیە گرنگیی و پێشخستن بۆ ئەو پێویستییە بێت کە لە پێویستبووندا لەپێشەوەیە و لە پلەبەندی پێویستییەکاندا لەسەرەوەیە، ئەمە بە تایبەتی لە کاتێکدا کە دوو پێویستی لە جێبەجێ کردندا تێکگیرانیان هەبێت، دەبێ گرنگی و ئەولەویەت بدرێ بەو پێویستییەیان کە لە پلەبەندییەکەدا لەپێشترە[2].

---

١ . هەمان سەرچاوە پێشوو، ١٧٤.

٢ . هەمان سەرچاوە، ٢٦٥.

## عیزەددینی کوڕی عەبدوسسەلام و "دانایی ئەودیو حوکمەکان"

عیزەدینـی کـوڕی عەبدوسـەلام (سـاڵی ٦٦٠ك - ١٢٠٩ز وەفـاتی کـردووە) دوو کتێبی قەبارە بچووکی نووسیوە تایبەت بـە مەبەسـتەکان، لـەو ڕووەوە کـە باسـی "حیکمـەت لـە پـشتی فەرمانـە شـەرعییەکان"ەوە دەکـەن، ئـەوانیش "مقاصـد الصلاة" و "مقاصد الصوم"ن[1]، بەڵام بەشداری دیار و بەرچـاوی لـە پێشخـستنی تیۆری مەبەسـتەکاندا لـە کتێبەکەیـدا دەربـارەی بەرژەوەندییـەکان دەردەکـەوێت "قواعد الأحكام في مصالح الأنام".

لەپاڵ ئەوەدا کە عیزەدینی کوڕی عەبدوسـەلام هـەڵێنجانێکی فراوانـی کـردووە بـۆ چـەمکی بەرژەوەنـدی و خراپـەکان (المـصالح والمفاسـد)، هەوڵیـشیداوە حوکمـەکان ببەسـتێتەوە بـە مەبەسـتەکانیانەوە و ئـەو هۆکـار و حیکمەتانـە ڕوون بکاتـەوە کـە لـە پـشت فەرمانـە شـەرعییەکانەوەن، بـۆ نموونـە دەنووسـێت: "هەرکەسێك بە شوێن مەبەستی شەرعدا بگەڕێ لە هێنـانی بەرژەوەندییـەکان یـان لادانی خراپەکان ئەوا دەگاتە ئـەو قەناعـەت و بڕوایـەی کـە ئـەم مەبەسـتە نـاکرێ پشتگوێ بخرێ، ئەم خراپەیەش ناکرێ لێـی نزیـك بکەویتـەوە، ئەگەرچـی دەقێـك یـان کـۆدەنگیی یـان قیاسـیش نـەبێت هـەر تێگەیـشتن لـە خـودی شـەریعەت وا پێویست دەکات پەیڕەوی چاکەکان بکەین و لە خراپەکان دوور بکەوینەوە[2].

---

[1]. العز بن عبدالسلام، مقاصد الصوم، تحرير: إياد الطباع، ط٢،بيروت، دار الفكر، ١٩٩٥.

[2]. العز بن عبدالسلام، قواعد الأحكام في مصالح الأنام، بيروت، دار النشر، بدون تأريخ، المجلد الثاني، ص١٦٠.

## ئیمامی قەڕافی و "جۆرەکانی هەڵسوکەوتی پێغەمبەر"

بەشدارییکردنی شیهابەدینی قەڕافی (ساڵی ٦٨٤ك ـ ١٢٨٥ز وەفاتی کردووە) لە تیۆری مەبەستەکاندا بەمشێوەیەی ئەمڕۆ هەیە، لەوەدا دەردەکەوێت کە جیاوازی کرد لە نێوان کارە جۆراوجۆرەکانی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەمەش لەسەر بنچینەی "مەبەست"ی خودی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، لەمبارەیەوە قەڕافی لە کتێبی (الفروق)دا دەڵێ:

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) جیاوازی کردووە لە نێوان هەڵسوکەوت کردنی دادوەریی و هەڵسوکەوتی فتوادان کە ئاگادارکردنەوەیە و هەڵسوکەوتی ئیمامەت و پێشەوایەتیدا... کاریگەریی ئەو هەڵسوکەوتە جیاوازانەش لەشەریعەتدا دەگۆڕێت.... هەرچی فەرموویەتی و کردوویەتی بۆ گەیاندن و تەبلیغکردنی خەڵکی ئەوە حوکمی گشتییە... بەڵام ناردنی سوپا و سەرفکردنی پارەیماڵی مسوڵمانان و دادوەریکردن و دابەشکردنی دەسکەوت و بەستنی پەیماننامە، ئەوا هەمووی بە ڕێگای پێشەوایەتییە نەك شتی تر[1].

بەمشێوەیە قەڕافی مانای مەبەستەکان فراوان دەکات و دەیبەستێتەوە بە مەبەست و ویستی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە هەڵسوکەوتەکانیدا، ئیبنو عاشوور (ساڵی ١٩٧٦ز وەفاتی کردووە) ئەم "جیاوازییانە"ی قەڕافی کە باسمان کردن دەکاتە بەشێك لە پێناسەی مەبەستەکان[2]، وەکو لە دواتردا باسی دەکەین.

هەروەها قەڕافی دەنووسێت دەربارەی "کردنەوەی ڕێگاکان بەرەو چاکەکردن بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی" واتە "فتح الذرائع لتحقيق المصالح"، ئەمەش

---

[1] . شهاب الدين القرافي، الفروق (مع هوامشه)، تحرير: خالد منصور، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٩٩٨، المجلد الأول، ص٣٥٧.

[2] . ابن عاشور ، مقاصد الشريعة الإسلامية، ص١٠٠.

فراوانکردنێکـی گرنگـی تـری تیـۆری مەبەسـتەکانە، ئـەو دەڵێـت: ئـەو ڕێگـا و هۆکارانەی دەبنە هۆی خراپەکاری دەبێت دابخرێن، ئەو ڕێگا و هۆکارانەشی دەبنە هۆی بەدەسـتهێنانی بەرژەوەندییـەکان دەبێـت بکرێنـەوە[1]، بەمـشێوەیە قـەڕافی خۆی نەبەستووەتەوە بە تەنها لایەنە سەلبییەکەی "ڕێگریـی لـە دەرەنجامـەکان ـ سد الذرائع"، هەروەکو دوایی زیاتر لێی دەدوێین.

## ئیمام ئیبنو لقەییم و "ڕاستیی شەریعەت"

شەمـسەدین ئیبنـو لقـەییم (سـاڵی ٧٤٨ك ـ ١٣٤٧ز وەفـاتی کـردووە) قوتـابی شێخو لئیسلام ئیبنو تەیمیە (٧٢٨ك ـ ١٣٢٨ز وەفاتی کردووە) بـووە، دەتـوانین بەشـداری ئـەو لـە تیـۆری مەبەسـتەکاندا سـەرەتا لـە توێژینەوەیـەکی بـەپێز و تێروپڕیـدا بـزانین بـە ناونیـشانی (الحِيَـل الفقهيـة)، ئـەویش لـەو ڕاسـتییەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئـەم فێڵـە فیقهییانـە لەگـەڵ مەبەسـتەکاندا دژیـەکن، فـێڵ چوونە ناو حەرامکراوێکە وەکو ، بەرتیل یان سوود، ئەگەرچی ڕووکەشـەکەی وایـە شەرعی بێت، بۆ نموونە وەکو بازرگـانی یـان بەخـشش دەربکـەوێت، ئیبنـو قـەییم دەنووسێت:

ئەوەی بەڵگەیە لەسەر بەتاڵبوونەوەی فێڵەکان و حەرامبوونیان ئەوەیـە خـوای گـەورە پێویـستییەکانی واجـب کـردووە و حەرامکراوەکانیـشی قەدەغـە کـردووە، چونکە بەرژەوەندی بەندەکانی تیایە لـەژیان و دوارۆژیانـدا،.... ئەگـەر بەندەیـەك فێڵی کرد بـۆ حـەڵاڵکردنی ئـەوەی خـوا حـەرامی کـردووە، نـەکردنی ئـەوەی خـوا لەسەری داناوە، پەکی شەریعەتی خوای خـست، ئـەوا لـە چـەند لایەکـەوە هـەوڵی خراپەکاریی لە دینی خوادا داوە: یەکەمیان بەتاڵکردنەوەی حیکمەتی یاسادانەر لە کارە فێڵ تیاکراوەکەدا، هەڵوەشاندنەوەی حیکمـەت و دژایـەتیکردنی، دووەم ئـەو

---

[1] . القرافي، الذخيرة، المجلد الأول، ص١٥٣، القرافي، الفرقان (مع هوامشه)، المجلد الثاني، ص٦٠.

کارەی فێڵی تیا کردووە هیچ حەقیقەتێکی نییە و ئەویش مەبەست نییە، بەڵکو ئەوە ڕووکاری دەرەوەی ڕێگەپێدراوەکەیە، کەواتە مەبەستی ڕێگەپێدراوەکە نییە، بەڵکو خودی حەرامکراوەکەیە کە ئەویش دیارو ئاشکرایە لای یاسادانەر، بۆ نموونە ئەوەی سوو دەدات مەبەستی کڕین و فرۆشتنە ڕێگەپێدراوەکە نییە، بەڵکو مەبەستی سوودە حەرامەکەیە، یان ئەو کەسەی ماڵ دەبەخشێت بەکەسێك کە لەبنەڕەتدا مەبەستی بەخشین نییە، بەڵکو جێبەجێ نەکردنی فەرمانی خوایە و بەرتیلدانە، بەڵام لە ڕووکەشدا بەخششە کە لە دڵیدا مەبەستی بەخشین نییە،... بێگومان شەریعەت بۆ دڵ و دەروون وەکو خواردن و دەرمان وایە بۆ جەستە، بەڵام ئەمە بە حەقیقەت و ڕاستییەوە نەك تەنها بە ڕووکەش و ناو.

ئیبنو لقەییم ڕێچکە فیقهییەکەی خۆی ڕوونکردووەتەوە بەوەی بنیاتنراوە لەسەر "حیکمەت و بەرژەوەندی مرۆڤ" ئەمەش لەم دەستەواژە بەهێزانەدا دەبینین:

بنچینە و بنەمای شەریعەت لەسەر حیکمەت و بەرژەوەندی بەندەکان لە دنیا و دوارۆژ دامەزراوە، هەمووی دادگەرییە، هەمووی ڕەحمەتە، هەمووی داناییە، هەمووی بەرژەوەندییە، هەر بابەتێك لە دادگەرییەوە چوو بەرەو ستەم، لە ڕەحمەتەوە بەرەو دژەکەی، لە بەرژەوەندییەوە بەرەو خراپە، لە حیکمەتەوە بەرەو نەزانی، ئەوە هیچ پەیوەندییەکی بە شەریعەتەوە نییە، ئەگەرچی بە تەئویلکردن بتەوێ بیخەیتە ناو شەریعەتەوە[1].

ئەم بڕگەیەی وەرمانگرت لێرەدا بەڕای من گرنگترین "ڕێسا"یە بۆ تێگەیشتن لە سروشتی یاسادانانی ئیسلامیی، لێرەدا دەبینین مەبەستەکانی شەریعەت شوێنی ڕاستەقینەی خۆیان وەرگرتووە، بەوەی بوونەتە "بنچینە و بنەما"، یان

---

[1] . شمس الدين ابن القييم، إعلام الموقعين، تحرير: طه عبدالرؤوف سعد، بيروت، دار الجيل، ١٩٧٣، المجلد الأول، ص٣٣٣.

بوون بە سەرتاپای فەلسەفەی یاسادانان بە دەربڕینی هاوچەرخ، هەر ئەمەشە ئیمامی شاتبی بە ڕوونی و بەهێزتر دەریبڕیووە.

## ئیمامی شاتبی و سەیرکردنی مەبەستەکان وەك "بەشێك لە بنچینەکانی شەریعەت"

ئەو زاراوانەی لە مەبەستەکاندا ئەبو ئیسحاقی شاتبی (ساڵی ٧٩٠ك - ١٣٨٨ز وەفاتی کردووە) بەکاری هێناون، بەگشتی هەمان ئەو زاراوانەن کە جوەینی و قوتابییەکەی، غەزالی، بەکاریان هێناون، بەڵام من پێموایە کە کتێبەکەی شاتبی "الموافقات في أصول الشريعة" سێ هەنگاوی گرنگ تیۆری مەبەستەکانی بردووەتە پێشەوە:

**أ - یەکەم:** لە "بەرژەوەندییە ڕەهاکراوەکان"ەوە بۆ "بنچینەکانی شەریعەت"

مەبەستەکان پێش کتێبی"الموافقات"ی شاتبی وەکو بەشێك لە بەرژەوەندییە ڕەهاکراوەکان سەیر دەکران، هەرگیز وا سەیر نەکراون کە بنچینەی سەربەخۆن و لقی هیچ شتێکیتر نین، ئەوەبوو لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد، شاتبی لە بەشی تایبەت بە مەبەستەکان لە کتێبەکەیدا "الموافقات" بەچەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دەست پێدەکات بۆ ئەوەی بیسەلمێنیت کە خوای گەورە مەبەستی هەیە لە دروستکراوەکانی و ناردنی پێغەمبەران و ئەو شەریعەتەی ناردوویەتیە خوارەوە[1]، دواتر وایداناوە کە مەبەستەکان "بنچینەی ئایین و ڕێساکانی شەریعەت و شتە گشتییەکانی مرۆڤایەتین"[2].

**ب - دووەم:** لە "حیکمەت لە پشت حوکمەکان"ەوە بۆ "ڕێساکانی حوکمەکان".

---

[1] . الشاطبي، الموافقات، المجلد الثاني، ص٦.

[2] . المصدر نفسه، المجلد الثاني، ص٢٥.

شاتبی پشتی بەستووە بە بیرۆکەی گرنگی و پێشەنگایەتی (الأولوية) بە مەبەستەکان و گشتێتیان تاکو بگاتە ئەوەی کە "شتە گشتییەکان" بەتایبەتی "پێویستییە بنەڕەتیەکان" ناتوانرێ حوکمیان بەسەردا بدرێت بە حوکمە تایبەتییەکان[1]، ئەم بنەمایە هەنگاوێکی یەکلاکەرەوە بوو تەنانەت لە مەزهەبی مالیکیشدا کە مەزهەبی شاتبی خۆیەتی، چونکە مەزهەبی مالیکی هەمیشە پێشەنگایەتی (الأولوية) دەدات بە بەڵگەی تایبەت لەسەر بەڵگەی گشتی[2]، نەك هەر ئەوە، بەڵکو شاتبی شارەزایی لە مەبەستەکاندا کردووە بە مەرجێکی پێویست بۆ هەڵێنجان لە هەموو ئاستەکاندا[3].

ج ـ **سێیەم**: لە "بۆچوون ـ الظنيَّة"ەوە بۆ "بڕانەوە ـ القطعية".

شاتبی بۆ ئەوەی پاڵپشت بکات بۆ ئەو گرنگییەی بە مەبەستەکانی داوە لە ناو بنچینەکانی شەریعەتدا، هەستاوە بە دەستپێکردنی کتێبەکەی دەربارەی مەبەستەکان، بە هێنانی کۆمەڵێك بەڵگە بۆ چەسپاندنی ئەوەی دەق خوێندنەوە (الاستقراء) کارێکی حەتمییە، ئەوەش ئەو مەنهەجەیە کە گرتوویەتیە بەر بۆ گەیشتن بە مەبەستەکان بە شێوەیەکی سەرەتایی، ئەمەش بە پشتبەستن بە کۆمەڵێك بەڵگە کە گفتوگۆی لەسەر کردوون[4]، ئەمەش هەنگاوێکی مەنهەجی ترە جیاوازە لە مەنهەجەکانی پێشوو کە لەسەر فەلسەفەی یۆنانی بنیاتنرابوون، هەمیشە دەق خوێندنەوەیان بە بۆچوون دادەنا، ئەم کتێبەی شاتبی بووە سەرچاوەی زانایان لە بابەتی مەبەستەکاندا تا سەدەی بیستەم، بەڵام پێشنیارەکەی کە بریتی بوو لەوەی مەبەستەکان ببنە بنچینەی شەریعەت، ئەو پێشوازییەی لێنەکرا و بەو شێوە فراوانە وەرنەگیرا.

---

[1] . المصدر نفسه، المجلد الثاني، ص٦١.

[2] . الريسوني، نظرية المقاصد، ص١٦٩.

[3] . الشاطبي، الموافقات، المجلد الرابع، ص٦.

[4] . المصدر نفسه، المجلد لاثاني، ص٦.

## بەشی سێیەم:

## ڕۆڵی مەبەستەکان لە نوێگەریی ئیسلامیی هاوچەرخدا

ئـەمڕۆ مەبەسـتەکانی شـەریعەت لـە گـرنگترین میکانیزمـەکانن کـە فیکـری ئیسلامیی هاوچەرخ بەهۆیانـەوە هـەوڵی چاکسازی و نوێگـەریی دەدات، بێگومـان کۆمەڵێك هەوڵی چاکسازی هەیە میدیاکان گرنگیی پێدەدەن، بـە تایبـەتی میـدیای ڕۆژئاوا، ئاراستەیەکی ڕەخنەئامێزی هەیە بەناو چاکسازی لە یاسادانانی ئیسلامیدا دەکات، جا بۆ گەلە مسوڵمانەکان بێت یان بۆ کەمینە مـسوڵمانەکانی وڵاتـانی تـر، بەڵام ئـەم هەوڵانـە زۆرجـار دەیانـەوێ ئیـسلام یـان مـسوڵمانان بگـونجێنن لەگـەڵ سیستمێکی ئەقڵی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت سیاسـیش، ئەمـە دوورە لـە ئیـسلام و بەرژەوەندی مسوڵمانان، بەڵام لەم سیاقەدا ڕۆڵی مەبەستەکانی شەریعەت ڕۆڵێکـی ئیجابیە و فەلسەفەی یاسادانانە و دەکرێت ببێتە پایەیەکی نوێکردنەوە، لەکاتێکدا مەبەسـتەکان لـە چوارچێوەی خـودی زانـستە ئیـسلامییەکاندا گەشـەی کـردووە، لەچوار دەوری ئەقڵی ئیسلامیی و لۆژیکی ئیـسلامیی بـۆ تێگەیـشتنی بوونـەوەر و ژیان، دەسوڕێتەوە، هەوڵدەدەین ئەمە ڕوون بکەینەوە لە میانی ئەو بڕگانـەی لـەم بەشەدا دێن، بەشێوەیەك بەچەند تێڕوانینێکی جیاواز سەیری دەکەین.

سـەرەتا یەکـەم: باسـێکی فیکـری ئیـسلامیی هاوچـەرخ دەکـەین لـە بـواری مەبەستەکاندا وەکـو پڕۆژەیـەکی "گەشـەپێدان" و "مـافی مـرۆڤ"، بـە دەربڕینـی هاوچـەرخ. دواتـر دووەم: باسـی مەبەسـتەکان دەکـەین وەك مەنهـەجێك بـۆ نوێکردنەوەیـەکی خـوازراو و پێویـست لـە بـواری فیقهـی ئیـسلامییدا، بەتایبـەتی دەربـارەی بیرۆکـەی جیـاوازییکردن لـە نێـوان ئامـانج و میکانیزمەکانـدا. ئینجـا سێیەم: ڕوونکردنەوەیەك پێشکەش دەکـەین دەربـارەی گرنگیـی مەبەسـتەکان لـە نوێکردنەوەی تێگەیشتنی قورئـان و سـوننەتدا. دواتـریش باسـی ئـەو مەنهەجـەی

هەڵێنجان دەکەین کە پشت دەبەستێت بە "باسکردنی خراپەکان" لەبەرامبەر هەڵوێستی تەقلیدی بانگەشەکار بۆ کورتهەڵهێنان لە "داخستنی دەرگای خراپەکان". چوارەم و کۆتایی: مەبەستەکان پێشکەش دەکەین وەك زەمینەیەکی هاوبەش لە نێوان سەرجەم مەزهەبە فیقهییەکاندا، هەروەها وەك زەمینەیەك بۆ گفتوگۆی ئایینەکان.

## مەبەستەکانی شەریعەت وەك پرۆژەیەك بۆ گەشەپێدان و مافەکانی مرۆڤ

لە کۆی ئەو بەشدارییەی شەرعزانان و بیرمەندانی هاوچەرخ کردوویانە لە زانستی مەبەستەکاندا، پشت بەستنە بەزاراوەگەلێك کە هەڵقوڵاوی زاراوە هاوچەرخەکانن، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەندێك بیرۆکەی "هاوچەرخبوون" ڕەتدەکەنەوە لە مەبەستەکانی شەریعەتدا[1]، ئێستا با هەندێك لەو بەشدارییانە باس بکەین.

توێژینەوە کۆنەکان "پاراستنی وەچە"یان وەکو یەکێك لە مەبەستە زۆر پێویستەکان هەژمار دەکرد کە شەریعەتی ئیسلام هەوڵی بەرجەستەکردنی دەدات، ئەمە لەو کاتەوە دەرکەوت کە کاتێك عامیری لە هەوڵە سەرەتاییەکانیدا لە میانی تیۆریزەکردنی سزاکان لە ئیسلامدا باسی "ڕێگریی لە پەردەلادان لەسەر نهێنی"[2] کردووە هەروەکو پێشتر باسکرا، لەدوای ئەویش ئیمامی جوەینی هات و قسەی زانایانی پێشخۆی گەشەپێدا دەربارەی "ڕێگرییەکان ـ المزاجر"، دەتوانین پێی بڵێین "تیۆری پاراستن ـ نظرية العصمة"، پاراستنی نەفس و ماڵ، وەکو باسکرا، لەمەوە سزای ئەو کەسەی شەرمی خەڵکی بریندار دەکات لەلای جوەینی دەچێتە

---

[1] . مثلا الشيخ علي جمعة، مفتي الديار المصرية في حوار شفهي معه بالقاهرة، كانون الأول/ديسمبر، ٢٠٠٥.

[2] . العامري، الإعلام، ص١٢٥.

ناو "پاراستنی داوێن"ەوە[1]، بەڵام زاراوەی "پاراستنی وەچە" ئەوا ئیمامی غەزالی دایهێناوە و کردوویەتی بە یەکێك لە مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلامیی لەسەر ئاستی پێویستییە بنەڕەتییەکان[2]، شاتبیش هەمان زاراوەی غەزالی بەکارهێناوە وەك پێشتر باسمان کرد.

مەبەست لێرەدا ئەوەیە بە هاتنی سەدەی بیستەم زانایان بەتایبەتی ئەوانەیان کە گرنگی بە بابەتی مەبەستەکانی شەریعەت دەدەن، گەشەیان بە زاراوەی "پاراستنی وەچە"دا تاکو ببێتە بەشێك لە تیۆری "هێشتنەوەی بنەماڵە" یاخود "پاراستنی خێزان"، بۆ نموونە ئەوە ئیبنو عاشوورە "مەبەستەکانی بنەماڵە" دەکاتە باسێکی سەربەخۆ لە کتێبەکەیدا دەربارەی مەبەستەکانی شەریعەت، هەندێك لە توێژەران ئەم ڕایەی ئیبنو عاشوور وەکو سەرلەنوێ داڕشتنەوەی "پاراستنی وەچە" سەیردەکەن بە دەربڕین و داڕشتنی نوێ، هەندێکیتریان بە تیۆرێکی نوێی دادەنێن کە شوێنی تیۆرە کۆنەکە دەگرێتەوە، هەرچیەك بێت ڕوونە کە ئەم بەشدارییەی ئیبنو عاشوور ڕێگای خۆشکرد بۆ زانایانی دوای خۆی تا تیۆری مەبەستەکان بەرەو ئاسۆیەکی فراوانتر ببەن، هەروەکو شێخ قەرزاوی "پێکهێنانی خێزانێکی بۆ خوا سوڵحاو" دەخاتە ناو مەبەستەکانی شەریعەتی ئسلامییەوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، ئەم زاراوەیە تێڕوانینێك دەردەخات بۆ کۆمەڵگا کە بنەماڵە یەکەی سەرەکیی پێکهاتنیەتی، ئەمەش بە مانای سڕینەوەی "ڕێگریی لە پەردەلادان لەسەر نهێنی" نایەت، یان لەکارخستنی "پاراستنی داوێن" یان لەبیرکردنی "پاراستنی وەچە"، بەڵکو بە واتای ئەوە دێت کە بەدی هێنانی ئەم مەبەستە تاکی و گشتییانە بەشێك بن لە بنیاتنانی خێزان و ئەنجامی ئەو بن و لە چوارچێوەی خێزاندا بهێنرێنەدی، ئەمە باشترە، بێگومان پێدانی ئەم

---

[1] . الجويني، البرهان، المجلد الثاني، ص٧٤٧.

[2] . الغزالي، المستصفى، ص٢٥٨.

پێشەنگایەتییە (الأولوية) بە بەرژەوەندی خێزان، دەبێتە پاڵپشت بۆ مافەکانی ئافرەت و ـ دیارە پێویستی بە پاڵپشت هەیە ئەگەر واقیعی هاوچەرخ لەبەرچاو بگرین ـ مافەکانی منداڵانیش کە نەوەی داهاتووی ئوممەتن، هەروەها هەموویان دەپارێزێت لە ستەم و مافخواردن، ئەم نەرمی نوواندنە لە پێشخستنی زاراوە مەبەستییەکاندا شەریعەت دەخاتە خزمەتی پرسە گرنگ و هاوچەرخەکانی ئەم ئوممەتە.

کەواتە ڕێگەی مەبەستەکانی دوای ئیبنو عاشوور هەمان ڕێگەی عامیریی نییە کە پێیوابوو بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکان دەبێت لە چوارچێوەی "سزاکان"دا بێت، هەروەها هەمان تێگەیشتنی غەزالیش نییە کە جەختی دەکردەوە لە "پاراستن" واتە پارێزگاریی لە زەرەر و خراپەکاریی، بەڵکو ئەم تیۆرە نوێیە ڕوودەکاتە "بەهاکان" و "سیستمەکان"، ئەم دووانەش زاراوەی ئیبنو عاشوورن[1]، بەڵام هەندێك لە زانایانی هاوچەرخ دژی تێکەڵکردنی چەمکی نوێن لەگەڵ مەبەستەکانی شەریعەتدا، وەکو دادگەریی و ئازادی، ئەمان پێیان وایە دەبێت ئەم چەمکە نوێیانە لەناو تیۆرە کۆنەکەدا جێگایان بکرێتەوە، وەکو "ئاو چۆن بەناو جۆگادا دەڕوات"[2]، بەڵام من هۆیەك نابینم بۆ ترس لە گەشەپێدانی تیۆری مەبەستەکان هەروەکو هەموو تیۆرەکانی تر پێشکەوتن بەخۆیانەوە دەبینن لە زانستەکانی تردا.

هەروەها بابەتی "پاراستنی ئەقڵ" تا سەردەمانێکی نزیك کورتهەڵاتبوو لە حەرامکردنی هۆشبەرەکان لە ئیسلامدا، دیارە ئەمە گرنگە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم زاراوەیە فراوان دەبێت لەم سەردەمەی ئێمەدا تا شتگەلێکی تر بگرێتەوە

---

[1] . ابن عاشو الطاهر، أصول النظام الاجتماعي في الإسلام، تحرير: محمد الطاهر المساوي، عمّان، دار النفائس، ٢٠٠١، ص٢٠٦.

[2] . مثلا الشيخ علي جمعة، مفتي الديار المصرية، محاورة شفهية، القاهرة، مصر، كانون الأول/ديسمبر، ٢٠٠٥.

وەکــو "بڵاوکردنــەوەی بیرکردنــەوەی زانــستی" و "ســەفەرکردن لــە پێنــاوی بەدەســتهێنانی زانــستدا" و "لــەناوبردنی گیــانی مێگــەل" و "زاڵبــوون بەســەر کۆچکردنی ئەقڵەکان لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا"[1].

هــەروەها لــە بابــەتی "پاراســتنی ئــابڕوو" و"پاراســتنی نــەفس"دا، ئــەم دوو زاراوەیــە لــە ئاســتی زۆر پێویــستەکاندا پــۆلێن دەکــرێن بــەپێی زاراوەی غــەزالی و شاتبی، هەروەها پێشتر باسی سزای "ئەتککردنی ئابڕوو"مـان کـرد لای عـامیریی، هەروەها جوەینی زاراوەی "پاراســتنی نەفــسەکان"ی پێـشنیار کردبـوو، تەنانـەت بابەتی "پاراستنی ئابڕوو" شوێنی تایبەتی خۆی هەبوو لای عەرەب، پـێش هـاتنی ئیسلامیش، ئەوەتا (عەنتەرە) شاعیری ناسراوی جاهیلی دەڵێـت لـە شـیعرەکانیدا دەربارەی شەڕکردنیان لەگەڵ کوڕانی (ضمضة) لەسەر پارێزگاریی لە ئابڕوو:

ولقد خشيت بأنْ أموتَ ولم تَدُرْ      للحَربِ دائرةٌ على ابنَي ضَمضَمِ
الشاتِمَي عِرضِي ولم اَشتِمهُما      والنَّاذِرَينِ إذا لم ألقَهُما دَمــي

واتــە: دەترســم بمــرم و شــەڕ ڕوونــەدات دژی دوو کوڕەکــەی (ضمــضم)، ئــەو دووانەی کە بەبێ ئەوەی من قسە بە ئابڕوویـان بڵـێم ئـەوان وتوویانـە بـە ئـابڕووی من، خوێنم لە گەردنیاندایە ئەگەر لەشەڕدا لێیان وەرنەگرمەوە.

هەروەها عەلی کوڕی ئەبو تالیب خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ:

سأمنحُ مالِي كلَّ من جاءَ طالِبــاً      وأجعَلهُ وَقفاً عَلى القَرضِ والفَرضِ
فإمَّا كَريمٌ صُنتُ بالمَالِ عِرضهُ      وإمَّا لَئيمٌ صُنتُ عَن لُؤمِهِ عِرضي

---

[1] . جاسر عودة، فقه المقاصد: إناطة الأحكام الشرعية بمقاصدها، فيرجينيا، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ٢٠٠٦، ص٢٠.

واتە: ماڵ و سامانەکە دەدەم بە هەر کەسێك بێت و داوام لێبکات، جا یان بە قەرز و دواتر بۆم بگێڕێتەوە، یاخود بێ بەرامبەر و وەك بەخشش بێت، ئەگەر پیاوی باش بوو ئەوا بەو ماڵە ئابڕوویم پاراستووە، خۆ ئەگەر خراپ بوو ئەوا ئابڕووی خۆمم لە بەرامبەریدا پاراستووە.

(حەسسانی کوڕی سابت)یش هەر دەربارەی هەمان مانا دەڵێت:

أصُـون عِرضي بِمالِي لا أدنِّسُـهُ　　　لا بَارَكَ اللّهُ بَعدَ العِرضِ فِي المَالِ

واتە: ئابڕووم بە ماڵ و سامانەکەم دەپارێزم و دەیکەمە قوربانی مانەوەی، دەك خوا بەرەکەت نەخاتە ماڵێکەوە بە بێ ئابڕوو مابێتەوە.

هەروەها پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە "خوێن و ئابڕوو و ماڵی هەموو مسوڵمانێك لەسەر مسوڵمانێکیتر حەرامە"[(١)]، بەڵام خەریکە لە لێکۆڵینەوەی هاوچەرخدا دەربارەی مەبەستەکان زاراوەی (پاراستنی شکۆی مرۆڤ ـ حفظ الكرامة الإنسانية) جێگای (پاراستنی ئابڕوو) دەگرێتەوە، ئەمە بە پێی دەربڕینی ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی هاوچەرخ، بۆ ئەوەی ئەمە ببێتە مەبەستێکی شەریعەت لە خودی خۆیدا[(٢)].

بێنەوبەرەیەکی زۆر هەیە دەربارەی گونجانی مافەکانی مرۆڤ لەگەڵ ئیسلامدا، چی لەسەر ئاستی توێژەرانی مسوڵمان بێت یان توێژەرانی نامسوڵمان[(٣)]، هەروەها

---

[١] . البخاري، المجلد الأول، ص٣٧.

[٢] . يوسف القرضاوي، مدخل لدراسة الشريعة الإسلامية، القاهرة، وهبة، ١٩٩٧، ص١٠١، عطية، نحو تفعيل مقاصد الشريعة، ص١٧٠، أحمد الريسوني، محمد الزحيلي، محمد الشبير، "مقاصد الريعة محور حقوق الإنسان، كتاب الأمة، عدد٨٧ (٢٠٠٢)، محمد العوّا، الفقه الإسلامي في طريق التجديد، القاهرة، المكتب الإسلامي، ١٩٩٨، ص١٩٥.

[٣] . محمد عثمان صالح، الإسلام نظام شامل لحماية وتعزيز حقوق الإنسان، بحث مقدم في المؤتمر الدولي للإسلام وحقوق الإنسان، الخرطوم، ٢٠٠٦.

لـە سـاڵی (١٩٨١)دا جارنامـەی ئیـسلامیی بـۆ مافـەکانی مـرۆڤ ڕاگەیـەنرا، کـە ژمارەیـەکی زۆر لـە زانایـان پێـی هەسـتان لـە هـەموو ئاراسـتە و بۆچـوونە ئیسلامییەکان، ئەم ڕاگەیاندنـەش لـە ڕێگـای یونـسکۆوە بـوو، ئـەم جارنامەیـە لـە بنـچینەدا پـشتی بـە قورئـان و فـەرموودە بەسـتبوو، هـەروەکو ئەوانـەی پێـی هەستابوون لە سەرچاوەکاندا ڕوونیان کردبووەوە. ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە ئـەم جارنامەیـە بەشـێوەیەکی گـشتی هـەموو ئـەو مافانـەی لـەخۆگرتبوو کـە لـە جارنامـەی جیهـانیی مافـەکانی مرۆڤـدا هـاتوون، وەکـو مـافی ژیـان، ئـازادی، یەکسانی، دادگەریی، دادگاییکردنی دادگەرانـە، ڕێگریـی لـە ئەشـکەنجەدان، مـافی پەنابەریی، ئـازادیی بیروبـاوەڕ و دەربـڕین، ئـازادیی کۆبوونـەوە، مـافی فێرکـردن، ئازادیی گەڕان و گواستنەوە[1].

بـەڵام هەنـدێك لـە ئەنـدامانی کۆمیـسیۆنی مافـەکانی مرۆڤـی سـەر بـە نەتـەوە یـەکگرتووەکان، دڕدۆنگیـی خۆیـان دەربـڕی سـەبارەت بـە جارنامـەی ئیـسلامیی مافەکانی مرۆڤ، چونکە - بەپێی قسەی ئەوان - "هەڕەشـەیەکی گەورەیـە بـۆ سـەر ئەو کۆدەنگییەی لە نێوان هەموو کلتوورەکاندا بەدیهاتووە، ئەویش لەو چەمکانەدا گەڵاڵـە بـووە کـە لەسـەر بنـەمای ئـەوان جارنامـەی جیهـانیی مافـەکانی مـرۆڤ ڕاگەیەنرا"[2]، بەڵام کۆمەڵێك ئەندامی تری ئەو کۆمیـسیۆنە ئـەوەیان ڕاگەیانـد کـە

---

[1] . جامعة تورنتو مكتبة الحقوق بورا لاسكن، الحمايـة الدوليـة لحقـوق الإنـسان، ٢٠٠٤، إحالـة في ١٥ كانون الثاني/ينـاير ٢٠٠٥، متوفر في موقع:
www.law.unhchr.cah/Huridocdca/Huridoca.nsf/(Sybol)/E.CN.٤.Sub.٢,٢٠٠٣.NGO.١٥.En.

[2] . لجنة الأمم المتحدة العليا لحقوق الإنسان، قضايا محددة في حقوق الإنسان، تموز/ يولية، ٢٠٠٣، إحالة في الأول من شباط/فبراير، ٢٠٠٥، متوفر في موقع:
www.unhchr.cah./Huridoca.nsf/(Symbol)/E.CN.٤.Sub.٢,٢٠٠٣.NGO.١٥.En.

جارنامەی ئیسلامیی مافەکانی مرۆڤ "کۆمەڵێك لایەنی نوێی ئیجابی زیادکرد بۆ مافەکانی مرۆڤ، چونکە بە پێچەوانەی جارنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ ڕەهەندێکی خوایی بەم مافانە دەبەخشێت، ئەمەش کۆمەڵێك پاڵنەری ئەخلاقی دروست دەکات بۆ پەیڕەوکردنی ئەم مافانە"[1]، ئاراستەی مەبەستێتی بۆ مافەکانی مرۆڤ ئەم بیرۆکەیەی دووەم پشتڕاست دەکاتەوە، بەڵام دڕدۆنگیی کۆمەڵی یەکەمیش لەبەرچاو دەگرێت، بەتایبەتی ئەگەر بمانەوێ زاراوەکانی مەبەستەکان ببنە زاراوەی هاوچەرخ و ڕۆڵێکی ڕادیکاڵیتر ببینن لە بیرکردنەوەی یاسای نێودەوڵەتی، بێگومان بابەتی پەیوەندیی نێوان مافەکانی مرۆڤ و مەبەستەکانی شەریعەت چاوەڕوانی توێژینەوەی زیاترە تا خاڵە کێشە لەسەرەکان چارەسەر بکات، ئەو خاڵانەی هەندێك لە توێژەران پێیانوایە لەسەر ئاستی جێبەجێکردن کێشەیان هەیە[2].

هەروەها زاراوەی "پاراستنی ئایین" کە غەزالی و شاتبی بەکاریان هێناوە و لە قسەکانی عامیریشدا ڕیشەیان هەبووە دەربارەی "ڕێگریی لە پاشگەزبوونەوە لە ئایین"، واتە ئەو سزایەی جێبەجێ دەکرێ لەسەر ئەو کەسەی لە ئایینی حەق پاشگەز دەبێتەوە[3]، بەڵام هەر هەمان تیۆر لەم سەردەمەدا بەشێوەیەکی تر فامراوەتەوە زۆر جیاواز لە پێشخۆی، ئێستا زاراوەی "ئازادیی باوەڕ پێبوون" بەکاردەهێنرێ کە زاراوەی ئیبنو عاشوورە[4]، یان "ئازادیی بیروباوەڕ" لە زاراوەی

---

1. المصدر نفسه.
2. صالح، "الإسلام هو نظام شامل لحماية وتعزيز حقوق الإنسان." مراد هوفمان، الإسلام عام ألفين، ط١، القاهرة، مكتبة الشروق، ١٩٩٥، ص٥٦.
3. العامري، الإعلام، ص١٢٥.
4. ابن عاشور مقاصد الشريعة الإسلامية، ٢٩٢.

توێـژەرانی هاوچـەرخیتردا[1]، ئـەو توێژەرانـەی لایـەنگریی لـە ئـازادیی بیروبـاوەڕ دەکـەن بـە مانـای هاوچـەرخ، پـشت بـە گـشتێتی ئایـەتی (لاَ إِكْرَاهَ فِـي الـدِّينِ)[2] دەبەسـتن، لەبەرئـەوەی بنەمایـەکی سـەرەکییە و بـەهێزترە لـە "سـزای هەڵگەڕانەوە" کە لە فیقهی تەقلیدیدا هاتووە لە میانەی "پاراستنی ئایین"دا وەکو سزایەك بۆ ئەو کەسەی ئایینەکەی دەگۆڕێت، ئەگەرچـی تـاوانێکی تریـشی لـەپاڵ هەڵگەڕانەوەکەیدا نەکردبێت، دەبیـنین ـ لـە مێـژوودا ـ سزای هەڵگەڕانـەوە خـراپ بەکارهێنراوە بۆ مەبەستی سیاسـی و دەسـەڵاتدارەکان، بـەهیوای ئـەوەی ئـەمڕۆ بەهۆی مەبەستەکانی شەریعەتەوە بیگۆڕین بە چەمکی بنـەڕەتی کـە "زۆرلێکـردن نییە لە ئاییندا"، بەڵام ئەو بابەتە بێگومان پێویستی بە توێژینەوە هەیە.

لە کۆتاییدا زاراوەی "پاراستنی ماڵ و سامان" هـەروەکو لای غـەزالی هـاتووە، کە هاوتای دەربڕینی عامیریـە دەربـارەی "ڕێگریـی لـە بردنـی سـامان یـان سـزای دزیکـردن"، هـەروەها قـسەی جـوەیینی دەربـارەی "پاراسـتنی مـاڵ و دارایـی" هەمووی گەشەیکرد لەم دواییەدا، بۆ ئەوەی بگونجێ لەگـەڵ زاراوە باوەکـانی ئـەم سەردەمە  لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتیدا، بۆ نموونە نووسین دەبینین لە بواری مەبەسـتەکانی شـەریعەتدا دەربـارەی: بـەدیهێنانی دادگـەریی و هاوتـایی و نزیککردنەوەی چینەکانی کۆمەڵگا، ئەمە جگە لـە پاراسـتنی سـامانی تاکـەکان لـە دەستدرێژی و داگیرکـران و حـەرامکردنی سـوود، ئەمـەش چـەمکی بنەڕەتییـە[3]،

---

[1] . عطية، نحو تفعيل مقاصد الشريعة، ص١٧١، الريسوني، الزحيلي، والشبير، "حقوق الإنسان محور مقاصد الشريعة".

[2] . القرآن الكريم، سـورة البقـرة، الآيـة ٢٥٦، مـن وا لـەم ئایەتـە تێدەگـەم کـە جـائیز نییـە لـە هـیچ فەرمانێك لە فەرمانەکانی ئاییندا زۆر لە خەڵکی بکرێت نەك لـە هـەموو ئاییـنـدا (كمـا هـو الأمـر في ترجمة يوسف علي وبيكثول).

[3] . قطُب سـانو، قـراءة معرفيـة في الفكـر الأصـولي، ط١، (كـوالا لامبـور: دار التجديـد، ٢٠٠٥) ص١٥٧.

ئەمجۆرە پێشکەوتن و گەشەکردنە هەل دەڕەخسێنێت بۆ ئەوەی مەبەستەکانی شەریعەت هانی گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی بدات، ئەمەش هەموو ئەو وڵاتانەی زۆرینەیان مسوڵمانە پێویستییەکی زۆریان پێیەتی، هەر وەکو دەکرێ ببێت بە "ئەلتەرناتیڤی ئیسلامیی - البديل الإسلامي" لەبواری وەبەرهێناندا، ئەمەش ئەلتەرناتیڤێکە ئێستا برەوێکی فراوانی هەیە، تەنانەت لەو وڵاتانەش کە زۆرینەیان مسوڵمان نین، بەتایبەتی لە سایەی ئەم تەنگژە ئابوورییەی ئەم دواییەی جیهاندا.

"گەشەپێدانی مرۆیی" ئەو چەمکەی گەشەپێدانە کە ڕاپۆرتەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان دەربارەی ئەم بابەتە دەیکاتە بنەما، ئەمەش چەمکێکی فراوانترە لە چەمکی گەشەپێدانی ئابووری، بەپێی نوێترین ڕاپۆرتی بەرنامەی گەشەپێدانی نەتەوە یەکگرتووەکان، وڵاتانی خاوەن زۆرینەی مسوڵمان لە ڕیزبەندی گەشەپێداندا لە خوار ئاستی پێشکەوتوو دێن بە پێی "ئاماژەی گەشەپێدانی مرۆیی"، ئەم ئاماژەیەش بەپێی لێکدانەوەیەك کراوە هەڵێنجراو لە زیاتر لە (دوو سەد) ئاماژە، لەوانە: ڕێژەی بەشداریی سیاسی، کەمی نەخوێندەواریی، ڕێژەی چوونە قوتابخانە و زانکۆکان، درێژی تەمەنی چاوەڕوانکراو، هەبوونی ئاوی پاك، کەمی بێکاریی، ئاستی بژێوی، پێوەرەکانی دادگەریی کۆمەڵایەتی، بەڵام هەندێك لە وڵاتانی زۆرینە مسوڵمان بەتایبەتی وڵاتە دەوڵەمەندەکان بە نەوت، جیاوازییەکی زۆریان تیایە بەپێی ڕاپۆرتی نەتەوە یەکگرتووەکان کە باسمان کرد، لە نێوان دەسهاتی نەتەوەیی و پێوەرەکانی دادگەریی کۆمەڵایەتیدا، بە تایبەتی بەشداریی ئافرەتان لە ژیانی گشتییدا و بەشداریی بواری ئابووری[1].

---

١ . برنامج الأمم المتحدة للتطوير، التقرير السنوي ٢٠٠٤ (٢٠٠٤ إحالة في الخامس من شباط/فبراير، ٢٠٠٥) متوفر في موقع:

www.undp.org/annulreports/english.

لەپاڵ ئەو کەمینە مسوڵمانانەی لە وڵاتانی پێشکەوتوودا دەژین، هەندێك وڵاتی زۆرینــە مــسوڵمان خراونەتــە نــاو کۆمەڵــەی "ئــەو وڵاتانــەی گەشــەپێدان تیایانــدا بەرزە"، وەکو برۆنـای، قەتــەر، میرنـشینە عەرەبییــە یــەکگرتووەکان، بـەڵام ئـەو کۆمەڵانەی باسمان کردن ئەگەر بەیەکەوە کۆیان بکەینەوە ناگەنە لەسەدا یـەك لـە کۆی گشتیی مسوڵمانان، هـەروەها کۆمـەڵێك وڵات لـە خـوارترین ڕێـژەی ئامـاژەی گەشەپێدانی مرۆییدان وەکـو یەمـەن و نێجیریـا و مۆریتانیـا و جیبـۆتی و زامبیـا و سەنیگال و کینیا و سـاحیل عـاج و مـالی و نەیجـەر (کـۆی گـشتیی ئـەم وڵاتانـەش دەکاتە نزیکەی لەسەدا (دە)ی کۆی ژمارەی مسوڵمانان).

پێـشنیار دەکـەم (هێمـای گەشـەپێدانی مرۆیـی) بکەینـە پێوەرێـك بـۆ ڕادەی بــەدیهێنانی "بەرژەوەندییــە گــشتییەکان" لــەم ســەردەمەدا، بەشــێوەیەك کــە شەریعەت دەیەوێ ئاستێکی باش بەدی بهێنێت لـەم ئامـاژە و هێمایـە لـە میانـەی حوکمە جۆراوجۆرەکانی هەڵسوکەتەکانەوە، ئەم جـۆرە تێگەیـشتنە لـە مەبەسـتی حوکمـە شـەرعییەکان دەمانگەیەنێتـە ئـەوەی کـە ڕادەی بـەدیهاتنی گەشـەپێدان بپێوین لە واقیعـدا بـە پێوانەیـەکی کـرداری پـشتبەستوو بەڕێساگەلێکی زانستی. ئێمـە پێویـستیمان بـە توێژینـەوەی زیـاترە لـە بـواری گەشـەپێدانی مرۆییـدا لـە تێڕوانینی مەبەسـتەکانی شـەریعەتەوە، هـەروەکو لـە بـواری مافـەکانی مرۆڤیـشدا باسمـان کـرد، بـەڵام ئێمـە لێـرەدا دەڵـێین پێـشکەوتنی چـەمکی "مەبەسـتەکانی یاسادانانی ئیسلامیی" و فراونبـوونی تـا ئامانجگـەلێك بگرێتـەوە لـە گەشـەپێدانی مرۆییـدا بـە تێڕوانینـی ئیـسلامیی، ئـەوا بنـچینەیەکی بـەهێز دروسـت دەکـات بـۆ ســەرلەنوێ هەســتانەوەی جیهــانی ئیــسلامیی، لــەجیاتی ئــەوەی بمێننــەوە لــە پاشــکۆیەتی وڵاتــانی پێــشکەوتوودا و تەنانــەت لــە چــەمکی گەشــەپێدان و پێشکەوتنیشدا شوێنکەوتەی ئەوان بن.

## مەبەستەكان وەك بنچینەیەك بۆ ئیجتیهادێكی نوێ

لە ئوسوڵی فیقهی ئیسلامییدا جیاوازی هەیە لەنێوان تێكگیران (تعارض) یان ناكۆكیی بەڵگەكان (جا ئایەت بن یان فەرمووده) و دژیەكی (تناقض) ئەو بەڵگانە[1]، بۆیە دژیەكی پێناسەكراوە بەوەی ئەنجامێكی لۆژیكی دابەشبوونی ڕاست و هەڵەیە، یاخود بوونی ڕاستی یان ناڕاستی لە یەك كاتدا و لە پرسێكی دیارییكراودا بەبێ بوونی گریمانەی سێیەم[2].

بەڵام تێكگیران یان جیاوازی لە نێوان بەڵگەكاندا بریتیە لە "بوونی جیاوازی لە زەینی موجتەهیددا نەك لە خودی كارەكەدا"[3]، ئەمەش بەواتای ئەوەیە كاتێك دوو بەڵگە (لە قورئان و سوننەت) دێنە بەردەستی موجتەهید لە ڕووكەشدا تێكگیران لە نێوانیاندا هەیە، ئەوە ناگەیەنێ كە دژی یەكترین و ڕێگا چارەی تر نییە لەنێوانیاندا، لەوانەیە دژبوونەكە لە تێگەیشتنی شەرعزانەكەدا بێت كە لایوایە ئەم دوو بەڵگەیە كۆك نین و كۆناكرێنەوە بەیەكەوە لەبەر تێنەگەیشتنی فەرموودەكە، سەرەڕای ئەوەش لەوانەیە كەموكوڕییەك هەبێت لە زانیارییەكانی گێڕانەوەی فەرموودەكەدا، دەربارەی كات یان هەلومەرج یاخود ئەو شوێنەی ئەو دەقەی تیا وتراوە، ئەم هۆكارانە ڕۆڵی كاریگەریان هەیە لە تێگەیشتن و جێبەجێكردندا[4].

بۆیە لەوانەیە دەركەوێ لە ئەنجامی لێكۆڵینەوەدا كە یەكێك لەم دوو فەرموودە "تێكگیراوە" بەڕێگایەكی ڕاست نەگەیشتووە، بەمشێوەیە كێشەكە دەڕەوێتەوە و

---

[1] . الغزالي، المستصفى في أصول الفقه، ص٢٧٩، الشاطبي، الوافقات، المجلد الرابع، ص١٢٩، ابن تيمية، كتب ورسائل وفتوى، تحرير: عبدالرحمن النجدي، ط٢، الرياض، مككتبة ابن تيمية، بدون تأريخ، المجلد التاسع عشر، ص١٣١.

[2] . الغزالي، مقاصد الفلاسفة، القاهرة، دار المعارف، ١٩٦١، ص٦٢.

[3] . ابن تيمية، كتب ورسائل وفتاوى، المجلد التاسع عشر، ص١٣١.

[4] . عبدالعزيز البخاري، كشف الأسرار، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٩٩٧، المجلد الثالث، ص٧٧.

لەگـەڵ یـەك فـەرموودەی ڕاسـتدا دەمێنینـەوە، ئەمـەی شـەرعزانان پێـی دەڵـێن "یەکلاکردنـەوە ـ الترجيح"، بـەڵام یەکلاکردنـەوەش زۆرجـار هۆکـاری لایـەنگیریی تێدەکـەوێ و بێلایـەنی لەدەسـت دەدات، نموونـەی ئەمـەش ئەوەیـە کـە ئـەبوو هـورەیرە گێڕاویەتـەوە، هـەروەکو ئەحمـەد لـە ئـەبوو حەسـسانەوە پـشتڕاستی کردووەتـەوە، دوو پیـاو چـوون بـۆ لای عائیـشە و وتوویانـە: ئـەبوو هـورەیرە لـە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) دەگێڕێتەوە کە ڕەشبینی و شوومی لە ئـافرەت و ئـاژەڵ و خانوودایـە"[1]، کەچـی عائیـشە (ڕەزای خـوای لـێ بێـت) وتوویەتی: سوێند بەو زاتەی قورئانی دابەزاندووە بۆ سەر ئەبو قاسم بەمـشێوەیە نـەیووتووە، بـەڵکو پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) دەیفـەرموو: ئـەهلی سـەردەمی نـەفامیی دەیـانووت: شـوومی و ڕەشـبینی لـە ئـافرەت و خـانوو و ئاژەڵدایە[2].

ئـەم دوو فەرموودەیـە لـە ڕواڵەتـدا جیـاوازن، بـەڵام ئـەوەی جێگـای سـەرنجە زۆربەی ڕاڤەکاران فەرموودەکەی عائیشەیان ڕەتکردووەتـەوە لەگـەڵ ئـەوەدا کـە فەرموودەی تر هەیە بەهێزی دەکات، هەروەکو ئەوەی موعاویەی کوڕی حەکیم لـە مامیەوە میخمەری کـوڕی موعاویـەوە دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت: گـوێم لـە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بوو دەیفەرموو: شوومیی نییە، بەڵام خێر و بەرەکەت دەکـرێ لـە ئـافرەت و وڵاخەبـەرزە و ئاژەڵـدا هـەبێت، لەگـەڵ ئەوەشـدا عائیـشە بەڵگەی بەم ئایەتە هێناوەتەوە لە سورەتی (الحديد) (مَـا أَصَـابَ مِـنْ مُـصِيبَةٍ فِـي الأَرْضِ وَلاَ فِـي أَنْفُـسِكُم إِلاَّ فِـي كِتَـابٍ مِـن قَبْـلِ أَنْ نَبْرَأَهَـا) (الحديـد٢٢)[3]. بـەڵام دەبیـنین (ابـن الجـوزي) بەمـشێوەیە دەدوێ: "ئەمـە ڕەتکردنـەوەی خەبـەرێکی

---

[1] . البخاري، الصحيح، ص٦٩.

[2] . المصدر نفسه.

[3] . عودة، فقه المقاصد، ص١٠٦.

ئاشـکرا و ڕوونــه کــه گێڕەرەوەکـانی جێگـای متمانــەن"، لەگـەڵ ئـەوەدا کـە خەبەرەکەی عائیشە فەرموودەیەکی ڕوونە و گێڕەرەوەکانیشی متمانـە پێکـراون، ئـەی وانییـە؟ ڕەخنـە لـەو قـسەیەی ئـەبوو بـەکری ئیبنـو عـەرەبی دەگیرێـت کـە وەسفی وتەکەی عائیشە دەکات بەوەی "قسەیەکی بێکەڵکە" بۆ ئیمـامێکی وەکـو ئەو نابێت قسەیەکی ئاوەها بە دایکی مـسوڵمانان عائیـشە بڵێـت![1] مەبەسـت لـە هێنانەوەی ئەم نموونەیە دەرخستنی ڕادەی قەناعەتی کەسەکانە لـە "نەهێـشتنی تێکگیران"دا.

بەڵام لە زۆربەی حاڵەتەکانی تێکگیرانـدا شـەرعزانان پێیانوایـە یـەکێك لـە دوو ئایەتەکە یان لە دوو فەرموودەکە نەسخ کراوەتەوە، واتە کاریگەریی نـەماوە، ئـەم نەسخ کردنەش ـ لای ئەوان ـ تەنها بەوە چەسـپاوە کـە یـەکێك لـەو دوو دەقـە لـە ڕووی مێژووەوە پێش ئەویتر کەوتبێ، واتـە تێکگیرانـی ئـەو دوو دەقـە نامێنێـت و چارەسەر دەبێت تەنها بەوەی دەقی نوێ دەقە کۆنەکە نەسخ بکاتەوە، بۆ نموونە ئەگەر دوو ئایەت هەبن یـەکێکیان دوای ئـەویتر دابـەزیبێت لـە ڕووی کاتـەوە ئـەوا نەسخ کەرەوەیە بـۆ ئـەوەی پێـشخۆی، فـەرموودەش هـەر بەمـشێوەیەیە، کاتێـك شــەرعزان (الفقیــە) مێــژووی دوو فــەرموودەی بــۆ دەردەکــەوێ کــە تــێکگیران لــە نێوانیاندا هەیە ـ بە بۆچوونی ئەو ـ بە یەکێك لەڕێگەکانی زانینی مێـژوو، ئـەوا ئـەو فەرموودەیەی دواتر وتراوە بەپێی کات دەبێتە نەسـخ کـەرەوەی هـەموو ئەوانـەی لەگەڵیدا یەکناگرنەوە کە پێش ئەو دەکەون، لەبەر ئەمە زۆرێك لە بەڵگـە کـە هـیچ گومانێکیان لەسەر نییە نە لەڕووی ناوەرۆك و ماناوە و نە لە ڕووی ئـەو کەسـانەی کـە گێڕاویانەتـەوە وازیـان لێهێنـراوە بەبەڵگـە وەرنـەگیراون، چـونکە زۆرێـك لـە

[1] . أبوبكر المالكي بـن العربـي، عارضـة الأحـوذي، القـاهرة، دار الـوحي المحمـدي، بـدون تـأريخ، المجلـد العاشر، ص٢٦٤.

شەرعزانان نەیانتوانیوە لە نەسەقێکی تۆکمە و بەیەکەوە بەستراودا کۆبکەنەوە لە چوارچێوەیەکی خوازراودا.

ئەوەی کە ڕوونە ئەمڕۆ و لە کتێبەکانی فەرموودەدا هاتووە بەهەموو قوتابخانە و ئـاییںزا جیاوازەکانیـەوە بەڵگەیـەك نییـە تیـۆری (نەسـخکردن) بـسەلمێنێت لـە وتـــەکانی پێغەمبـــەر (دروودی خـــوای لەســـەر بێـــت)دا بەوشـــێوەیەی لـــە وتـــەی شـەرعزاناندا هـاتووە، زۆر گـەڕام بـەدوای ڕەگوڕیـشەی وشـەی (نَ سَ خَ) و وشـە وەرگێراوەکانی تر کە دەکرێ لێوەی داتاشرێ و وەربگـیرێ لـە ژمارەیـەکی زۆر لـە کتێبە ناسراوەکان لـەمڕۆدا، لەناویانـدا بوخـاری و موسـلیم و تیرمـزی و نەسـائی و ئـەبو داوود و ئیبنـو ماجـە و ئەحمـەد و مالیـك و دارەمـی و موسـتەدرەك و ئیبنـو حیببـان و ئیبنـو خوزەیمـە و بەیهـەقی و دارەقـوتنی و ئیبنـو ئـەبی شـەیبە و عەبـدوڕڕەزاق، تـەنها فەرموودەیەکیـشم نـەبینی صـەحیح یـان حەسـەن بێـت و بگەڕێتەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) و یـەکێك لـە داتاشـراوەکان (المشتقات)ی ئەم وشەیەی تیابێت، تەنها ئەوەی کە بینیم نزیکەی (چـل) حاڵـەتی نەسخ بوو لـەم کتێبانـەدا هـاتبوو، هـەر هـەمووی دەگەڕایـەوە بـۆ ڕای یـەکێك لـە ڕاویەکان یـا ڕاڤـەکاران لـە لێکدانـەوەی (تـێکگیران)دا، نـەك بـۆ دەقـی فـەرموودە پیرۆزەکـە، بـەڵام لـە زۆربـەی حاڵەتەکانـدا نەسـخ بـە مانـای (تایبـەتکردن - التخصیص) هاتووە، واتە ئەو زانایانە حاڵەتەکانی تێکگیرانیان وا لێکداوەتەوە کە یەکێك لەو دوو فەرموودەیە "حاڵەتێکی تایبەت"یە لەو بنچینەیەی کە فەرموودەی دووەم باسی لێوە دەکـات، نـەك نەسـخ بـە مانـای (سـڕینەوە) هاتبێـت، هـەروەك دەبیـنین کتێبـە تەفـسیرە تەقلیدییـەکانیش تیـۆری نەسـخیان وەکـو سـڕینەوە و نەهێـشتن نەچەسـپاندووە لـە قورئانـدا، بـەو واتایـەی ئایەتـەکانی دوایـی حـوکمی

ئایەتەکانی پێشخۆیان ڕەتبکەنەوە، چونکە ئەو چەند ئایەتەی دەوترێ نەسخیان تیایە بەزۆری ڕاجیاییان لەسەرە[1].

ئەم نموونەیە ئەوە دەسەلمێنێت کە نەسخ زۆر بڵاوبووە بەبێ بەڵگە، ئەویش ئایەتی پێنجە لە سورەتی تەوبە، ئەو ئایەتەی بە "ئایەتی شمشێر" ناسراوە: (فَإِذَا انْسَلَخَ الأَشْهُرُ الحُرُمُ فَاقْتُلُواْ المُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُم وَخُذُوهُم وَاحْصُرُوهُم وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرصَدٍ) (التوبة: ٥)، کاتێك دەگەڕێینەوە بۆ بۆنەی دابەزینی ئایەتەکە دەبینین لە ساڵی نۆی کۆچیدا دابەزیوە، کاتێك شەڕ لە نێوان مسوڵمانان و کافرەکانی مەککەدا ڕوویدا، ئەو ئایەتانەی لەگەڵ ئەم ئایەتەدان هەموویان لە سیاقی ئەو شەڕەدا هاتوون، سورەتەکەش بابەتی گۆڕەپانی شەڕ باس دەکات، بەڵام ڕاڤەی ئایەتەکە دەری هێناوە لەناو ئایەتەکانی تردا و لەو هەلومەرجی شەڕەی دەربارەی دابەزیووە، وا لێکدراوەتەوەکە پەیوەندی نێوان مسوڵمانان و کافران دیاری دەکات لە هەموو سەردەم و شوێنێك و لە هەر هەلومەرجێکدا بێت، لێرەوە ئەوانەی دەڵێن ئەم ئایەتە نەسخکەرەوەیە حوکمی ئەوەدەدەن کە ئەم ئایەتە نزیکەی (دووسەد) ئایەتی تری قورئانی پیرۆزی نەسخ کردووەتەوە، هەموویان داوای گفتوگۆ و ئازادی بیروباوەڕ و لێبووردن و ئاشتی دەکەن، تەنانەت ئەو ئایەتانەشی داوای ئارامگرتن دەکەن، تاکە هەڵبژاردن کە ڕاڤەکاران پەنایان بۆ بردووە بۆ نەهێشتنی تێکگیران ئەوەیە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەم ئایەتە لە کۆتاییەکانی ژیانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)دا دابەزیوە و هەر ئایەتێك جیاوازبێت لێی ئەوا پێش ئەو دابەزیووە و نەسخ بووەتەوە بەهۆی ئەمەوە.

---

[1] . يمكن للقاريء أن يرجع إلى الرازي، التفسير الكبير، بيروت، دار الكتب العلمية، ٢٠٠٠، المجلد الثالث، ص٢٠٤، وإلى فضل بن الحسين الطبرسي، مجمع البيان في تفسير القرآن، بيروت، دار العلوم، ٢٠٠٥، المجلد الأول، ص٤٠٦، وإلى محمد ندا، النسخ في القرآن، القاهرة، الدار العربية للكتب، ١٩٩٦، ص٢٥.

لەبەر ئەمە بانگەشەی ئەوە دەکرێت ئەم ئایەتانەی دێن نەسخ کراونەتەوە: (لاَ إِكْرَاهَ فِـي الـدِّيْنِ) (البقـرة: ٢٥٦)، (فَـاعْفُ عَـنْهُمْ وَاصْـفَحْ إِنَّ اللَّـهَ يُحِـبُّ المُحْـسِنِينَ) (المائدة: ١٣)، (ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ) (المؤمنـون: ٩٦)، (فَاصْـبِرْ إِنَّ وَعْـدَ اللَّهِ حَقٌّ) (الرُّوم: ٦٠)، (وَلاَ تُجادِلُوا أَهْلَ الكِتَابِ إِلاَّ بِـالَّتِي هِـيَ أَحْـسَنُ) (العنكبـوت: ٤٦)، (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينٌ) (الكافرون: ٦)، جگە لەمانەش زۆرن.

هەروەها بە هەمان بانگەشە و بەبێ بەڵگە ژمارەیەکی زۆر فەرموودەیان نەسـخ کردووەتـەوە کـە ڕێگـا دەدات بـە ئاشـتی و بەیەکـەوە ژیـان لـەنێوان پێکهاتـە و کلتووره جیاوازەکاندا، بەدەربڕینی هاوچەرخ، لەو فەرموودانـەش پـەڕاوی مەدینـە یان پەیمانی مەدینە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لەگەڵ جوولەکـەدا پەیماننامەیەکی نووسـی تیایـدا پەیوەنـدی نێـوان مـسوڵمانان و ئـەو جوولەکانـەی دیاریکرد کە لە (يثرب)دا دەژیان، پەیمانەکە جەخت لەوە دەکاتەوە کـە مـسوڵمان و جوولەکەکان "یەك ئومەتن، مسوڵمانان ئایینی خۆیانیان هەیە و جوولەکەکانیش ئـــایینی خۆیـــان"[1]، بـــەڵام لـــەلای زۆرێـــك ڕاڤـــەکاران ئـــەو پەیماننامەیـــە نەسـخکراوەتەوە، لەسـەر بنـچینەی ئایـەتی "شمـشێر" و ئـەو ئایەتانـەی باسـی شەڕکردن دەکەن[2]، بۆیە کاتێـك مـرۆڤ سـەیری هـەموو ئـەو ئایـەت و فەرموودانـە دەکات کە هەندێکیان بڕیاری شەڕکردنیان تیایە و هەنـدێکیتریان ئاشـتی بەرقـەرار دەکەن، لەوانەیە وا هەست بکات کە تێکگیران لە نێوانیاندا هەیە، بەڵام مـن نـازانم بۆ دەبـێ ناچـاربین لـە نێـوان شـەڕی بـەردەوام و ئاشـتی هەمیـشەییدا یـەکێکیان هەڵبژێرین، لەهەموو سەردەم و کات و حاڵێکدا؟

---

[1] . برهان زريـق، الـصحيفة، ميثـاق الرسـول، الطبعـة الأولى، دمـشق، دار المـنير ودار معـد، ١٩٩٦، ص٣٥٣.

[2] . المصدر نفسه، ص٢١٦.

ئەوەی کە دڕدۆنگیی زیاتری لەسەر پرسی نەسخ دروست کردووە ئەوەیە کە حاڵەتەکانی نەسخ لای شوێنکەوتووان (التابعین) و شوێنکەوتووانی شوێنکەوتوواندا زۆر زیاترە وەك لەوەی لای هاوەڵان هەبووە[1]، دواتر و بە تێپەڕینی سەدەی یەکەم دەبینرێ شەرعزانان لە مەزهەبە جۆراوجۆرەکان دەستیان کردووە بە زیادکردنی حاڵەتەکانی نەسخ، حاڵەتگەلێك کە شوێنکەوتووان باسیان نەکردووە، هەروەکو ئەوەی نەسخکردنەوە ڕێگایەك بێت لەبەردەم شەرعزاندا تا بەرپەرچی هاوشێوەکانی پێبداتەوە لە مەزهەبەکانی تر، بۆ نموونە (ئەبوو حەسەنی کەرخی ـ ٩٥١ز وەفاتی کردووە) دەنووسێت: "ڕێسا لای ئێمە ئەوەیە هەر ئایەتێك ناکۆك بوو لەگەڵ ڕای هاوڕێیانمان ئەوا تەئویلکراوە یان نەسخکراوەتەوە"[2]، لەبەر ئەمە جێگای سەرسوڕمان نییە کە لە کتێبە فیقهییەکاندا حوکمێك ببینیت نەسخکەرەوە بێت لە مەزهەبێکدا و نەسخکراو بێت لە مەزهەبێکی تردا، چونکە نەسخ بووە بە کارێك وەکو ئەوەی هیچ پرەنسیپێکی نەبێت لەلای ژمارەیەك لە شەرعزانانی ئەم دواییە.

لێرەوە ڕۆڵی مەبەستەکانی شەریعەت دەست پێدەکات، چونکە مەبەستەکان ڕێگەچارەیەکی لۆجیکی و بنیاتنەر پێشکەش دەکەن بۆ کێشەی دەقە ناکۆکەکان، ئەمەش لەم نموونانەی دێن ڕووندەبێتەوە بۆ نەهێشتنی تێکگیرانی ڕواڵەتی لە ڕوانگەی مەبەستەکانەوە:

(١) ژمارەیەك لە بەڵگەی ناکۆك هەن دەربارەی ڕێگا جیاوازەکانی بەجێهێنانی بەندایەتی و ڕێوڕەسمەکان، هەمووشیان پاڵدراونە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بە شێوەیەکی صەحیح، بەڵام ـ بەداخەوە ـ ئەم

---

[1] . بناء على نفس الدراسة المسحية لكتب الحديث التي قمت بها، كما ذكرنا قبل قليل.

[2] . طه جابر العلواني، مقاصد الشريعة، في كتاب مقاصد الشريعة، تحرير: عبدالجبار الرفاعي، دمشق، دار الفكر، ٢٠٠١، ص٨٩.

گێڕانەوە جیاوازانە بوونەتە هۆی بێنەوبەرەیەکی زۆر و دوور و درێژ و کێشگەلێك لەناو مسوڵمانانەدا، تەنانەت لە یەك مزگەوتیشدا هەندێجار، بەڵام تێڕوانین لەم دەقانە لە دەلاقەی مەبەستەکانەوە دەمانگەیەنێتە ئەوەی مەبەستی "ئاسانکاریی" ببینین لە ئەنجامدانی ئەو عیبادەتانە بە ڕێگای جیاواز لەلایەن پێغەمبەرەوە (درووودی خوای لەسەر بێت)، ئەمەش وایکردووە نەرمییەکی فراوان ببینین کاتێك سەیری ئەم عیبادەتانە دەکەین[1]، لە نموونەی (شعائر)یش ڕێگە جیاوازەکانی دەستگرتن لە نوێژدا و هەموو جووڵەکانی ناو نوێژ[2]، چۆنیەتی شایەتمان هێنان[3] و چۆنیەتی سوجدەی سەهو[4] و دارشتە (صیغة)ی تەکبیرکردن لە نوێژی جەژنەکاندا[5]، ڕاجیایی لەسەر هەندێ وردەکاریی حەج و بابەتی تر[6].

(٢) ژمارەیەك گێڕانەوە هەن دەربارەی ئەو شتانەی پەیوەندییان بە "دابونەریت"ەوە هەیە، هەروەها پێشیان دەوترێت "وصف المتعارض"، بەڵام دەکرێ لەم ڕیوایەتانەوە جۆراوجۆریی بخوێنینەوە لە دیدگای مەبەستی

---

١. حسبما اقترحه عدد من الفقهاء، منهم منهم مثلا، الشافعي، الرسالة، صفحات ٢٧٢-٢٧٥، محمد الزرقاني، شرح الزرقاني على موطّأ الإمام مالك، ط١، بيروت، دار الكتب العلمية، بدون تأريخ، المجلد الأول، ص٢٢٩.

٢. السيواسي، شرح فتح القدير، المجلد الأول، ص٣١١، السرخسي، محمد بن أحمد، أصول السرخسي، بيروت، دار المعرفة، بدون تأريخ، المجلد الأول، ص١٢، والكاساني، علاءالدين، بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، ط٢، بيروت، دار الكتاب العربي، ١٩٨٢، المجلد الأول، ص٢٠٧.

٣. الشافعي، محمد بن إدريس، الرسالة، تحرير: أحمد شاكر، القاهرة، المدني، ١٩٣٩، صفحات ٢٧٢-٢٧٥.

٤. محمد بن عيسى الترمذي، الجامع الصحيح سنن الترمذي، تحرير: أحمد م.شاكر، بيروت، دار إحياء التراث العربي، بدون تأريخ، المجلد الثاني، ص٢٧٥.

٥. النووي، يحيى أبو زكريا، المجموع، بيروت، دار الفكر، ١٩٩٧، المجلد الرابع، ص١٤٥.

٦. الغزالي، المستصفى، المجلد الأول، صفحات ١٧٢-١٧٤.

"جیهانێتی شەریعەت"ەوە[1]، یان بە دەربڕینێکی تر، جیاوازی لە نێوان ئەم فەرموودە پیرۆزانە دەبێت وا حساب بکرێت کە جیاوازییە لەو دابونەریتانەدا کە فەرموودەکە ویستوویەتی دانی پیابنێت و بیچەسپێنێت، ئەمەش مانای "دژیەکبوون" ناگەیەنێ، بۆ نموونە دوو فەرموودە هەن هەردووکیان پاڵدەدرێنە لای عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) یەکێکیان شووکردنی ئافرەت قەدەغەدەکات بەهەر شێوەیەك بێت بەبێ ڕەزامەندیی بەشوودەر، جا باوکی بێت یان برای، (ئەبو داوود و ترمزی و ئیبنو ماجە و ئیبنو حیببان و حاکم و ئیبنو عەدی لە عائیشەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: "پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: هەر ئافرەتێك بەبێ ڕەزامەندیی بەشوودەرەکەی شوویکرد ئەوا نیکاحەکەی دانەمەزراوە - سێجار ئەمەی دووبارە کردووەتەوە") لەکاتێکدا لە فەرموودەیەکیتردا ڕێگا دەدات بە ئافرەتی بێوەژن، خۆی مێرد بۆ خۆی هەڵبژێرێ (مالیك لە (موطأ) و موسلیم لە ڕێگای مالیك و ئەبو داوود و ترمزی و ئیبنو ماجە و دارەمی لە عائیشەوە دەگێڕنەوە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: بێوەژن خۆی شایستەترە بەخۆی تا بەشوودەرەکەی و کچ ڕای وەردەگیرێ و بێدەنگبوونەکەی نیشانەی ڕازیبوونیەتی)[2]، هەروەها گێڕراوەتەوە کە عائیشە لەکاتێدا ئەم دوو فەرموودەیەی ڕیوایەتکردووە خۆی سەرپەرشتی کۆمەڵێك هاوسەرگیریی کردووە بەبێ جێبەجێکردنی مەرجی ڕازیبوونی بەشوودەر، هەستاوە بە بەشوودانی حەفصەی برازای کە کچی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبووبەکری کوڕی مونزیری کوڕی زوبەیرە، لەکاتێکدا عەبدوڕڕەحمان خۆی ئامادە نەبووە، "ئەمەش مانای ئەوەیە بۆچوونیان وابووە کە هاوسەرگیریی

[1]. ابن عاشور، مقاصد الشريعة الإسلامية، ص٢٣٦.

[2]. زين الدين بن نجيم، البحر الرائق، ط٢، بيروت، دار المعرفة، بدون تأريخ، المجلد الثالث، ص١١٧، علي المرغياني، الهداية شرح البداية، المكتبة الإسلامية، بدون تأريخ، المجلد الأول، ص١٩٧.

جائیزە بەبێ بەشوودەر"، هەروەك لێكدەرەوان وتوویانە[1]، هەندێك لە پەیڕەوانی مەزهەبی حەنەفی تەفسیری ئەو ڕێگریەیان لە ئافرەت كردووە كە ئامادەی پەیمانی مارەبڕین نەبێت ڕاستەخۆ تەنها لەبەر ئەوەی بەسووك سەیرنەكرێت، ئەمەش پەیوەندی بە دابونەریتەوە هەیە[2].

بەڵام تێگەیشتنی ئەم دوو فەرموودەیە بەیەكەوە لە سیاقی دابونەریتدا و بە لەبەرچاوگرتنی مەبەستی "جیهانێتی شەریعەت" كێشەی تێكگیرانەكە چارەسەر دەكات لە نێوانیاندا، هەروەها نەرمییەكیش بەدیدەهێنێت لە بەرپاكردنی مەراسیمی هاوسەرگیریدا بەپێی دابونەریتە جیاوازەكان لە هەموو شوێن و كاتێكدا، ئەم جۆرە هەڵوێستە كارئاسانیی بۆ مسوڵمانان دەكات لە هەموو شوێنێك كە دابونەریتی پەسەندی كۆمەڵگاكانیان ڕەچاو بكەن سەبارەت بەم مەراسیمە، بێگومان ئەگەر حەرامی تێنەكەوێت، ئەم تێگەیشتنە كلتووری پێكەوەژیان و لەیەكگەیشتن بەهێز دەكات لەناو كۆمەڵگا فرەپێكهاتە و فرە كلتوورەكاندا.

(٣) ژمارەیەك فەرمووده لە نەسخكراوەكان هەژمار كراون لەگەڵ ئەوەدا كە پلەبەندیی دەردەخەن لە جێبەجێكردنی فەرمانە شەرعییەكاندا، ئامانجیش لە پلەبەندیی لە جێبەجێكردنی فەرمانەكاندا ئاسانكارییە بۆ ئەو گۆڕانەی شەریعەت مەبەستیەتی بەدی بهێنێت لە نەریتە هەڵەكاندا كە لەناو كۆمەڵگایەكدا ڕەگیان داكوتاوە، یان ئاسانكارییە بۆ ڕاهێنانی كۆمەڵگا لەسەر نەریتی چاكە[3]. فەرموودە ناكۆكەكان دەربارەی حەرامكردنی مەی و سوود، یان پێویستبوونی نوێژ و ڕۆژوو، دەبێت لە سیاقی مەبەستی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) سەیر

---

1. السيواسي، شرح فتح القدير، المجلد الثالث، ص٢٥٨.
2. ابن عابدين، محمد أمين، حاشية رد المحتاج، بيروت، دار الفكر، ٢٠٠٠، المجلد الثالث، ص٥٥.
3. محمد الغزالي، نظرات في القرآن، القاهرة، نهضة مصر، ٢٠٠٢، ص١٩٤.

بکـرێن بـۆ جێبـەجێکردنی پلەبەپلـەی فەرمانـەکان لـە کۆمـەڵگادا، بـە تایبـەتی دەربارەی مسوڵمانە نوێیەکان، ئەوانە پێویستیان بە کاتێکی تەواو هەیە بۆ ڕاهاتن لەسەر پابەندبوون بە فەرمان و ڕێنماییەکانی ئیسلامەوە.

(٤) هەنـدێك لـە زانایـان ژمارەیـەك فـەرموودە بـە نـاكۆك لـە قەڵـەم دەدەن، لەبەرئـەوەی وشـەکانیان فـەرمانی جیاوازیـان لێـوە دەفامرێتـەوە بـۆ حاڵـەتی لەیەکچوو، بەڵام کاتێك سەیری ئەو فەرموودانە دەکەین بەو تێڕوانینەی کە ئەمانـە ڕووی گوتاریان لە خەڵکانی جیاواز و جۆراوجۆرە، ئەم ناکۆکییە دەڕەوێتەوە، لـەم حاڵەتانەشدا مەبەستی "بـەدیهێنانی زۆرتـرین بەرژەوەنـدیی بـۆ خـەڵکیی" کلیلـی تێگەیشتنی ئەم دەقانەیە بە پـشت بەسـتن بـەو جیاوازییـەی لـە نێـوان هاوەڵانـدا هەبووە کە ئەو فەرموودانە دەربارەیان وتـراوە، بـۆ نوونـە ژمارەیـەك فـەرموودەی پیرۆزمـان هەیـە دەریدەخـەن کـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) بـە ئافرەتێکی تەڵاقدراوی فەرمووە ئەگـەر شـووی کـردەوە ئـەوا مـافی بـەخێوکردنی منداڵەکانی لەدەست دەدات، ئەبو داوود لە باسی کێ مافی زیاترە بەسەر منداڵـەوە لە بەشی تەڵاقدا فەرموودەیەکی ڕیوایەتکردووە دەربارەی مافی بەخێوکردنی منداڵ لەلایەن دایکیەوە کاتێك شووی کردەوە: "لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەمرەوە دەڵێـت ئافرەتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کوڕەم لەسکی مندا بووە و لەمەمکەکانی منی خواردووە و باوەشی مـن لانـەی بـووە بـاوکی تـەڵاقی داووم و دەیـەوێ لێمـی بستێنێت، پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) پێیـووت: تـۆ لەپێـشتری بـۆی ئەگـەر شـوونەکەی"[1]، بـەڵام ژمارەیـەك فـەرموودە هـەن نـاکۆکن لەگـەڵ ئـەم فەرموودەیـەدا، وەکـو چـیرۆکی ئوممـو سـەلەمە کـە کوڕەکـەی لای مایـەوە دوای ئەوەی هاوسەرگیریی لەگەڵ پێغەمبـەردا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) کـرد، یـان چـیرۆکی کـچەکەی حـەمزە کـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) دای بـە

---

[1] . أبو داود، سنن أبي داود، مرجع سابق، كتاب الطلاق، باب من أحق بالولد، ج٢، ص٢٨٣.

پوورەکـەی (خوشـکی دایکـی) لەکاتێکـدا کـە هاوسـەردار بـوو[1]، بـەڵام زۆربـەی مەزهەبەکان پشتیان بە کۆمەڵـەی یەکـەم لـە فـەرموودەکان بەسـتووە بـۆ ئـەوەی بگەنە ئەو ئەنجامـەی کـە مـافی بـەخێوکردن ڕاسـتەوخۆ بـدرێت بـە بـاوك لـەکاتی شووکردنەوەی دایکەکەدا، لەمەدا ئەوانەی کۆمەڵـەی دووەمیـان لـە فـەرموودەکان پـشتگوێ خـستووە پێیانوایـە کۆمەڵـەی یەکـەم چەسـپاوترن، چـونکە بوخـاری ریوایەتی کردوون[2]، بەڵام ئیبنو حـەزم پـشتی بـە کۆمەڵـەی دووەم بەسـتووە لـە فـەرموودەکان و کۆمەڵـەی دووەمـی ڕەتکردووەتـەوە لەبـەر ئـەوەی گومـانی لـە بیرەوەریی یەکێك لـە ڕاویـەکان هەیـە[3]، بـەڵام صـەنعانی ـ دوای ئـەوەی هـەردوو کۆمەڵەکەی گێڕاوەتـەوە ـ حوکمەکـەی گێڕاوەتـەوە بـۆ: بەرژەوەنـدیی منداڵەکـە، ئەگەر هات و دایکەکە باشتر پارێزگاریی لێدەکرد لە بـاوکی و سـوورتر بـوو لەسـەر گرنگی پێدانی ئەوا دەدرێت بەو..... و کامیان سوودبەخشتر بـن بـۆی لای ئـەویان دەبێت" دواتر دەڵێت: "شەریعەتیش جگە لەمە هەڵناگرێ"[4].

لـەم وتەیـەدا بەرژەوەنـدی و دادگـەریی دەبیـنین کـراون بـە پێـوەر، نـاکرێ شەریعەت بە نادادیی یـان بـە لەبەرچـاو نـەگرتنی بەرژەوەنـدی تۆمـەتبار بکرێـت، مەبەستم بەرژەوەندی شەرعی ویستراوە، هەر بەم بۆنەیەشەوە ئەمجۆرە تێڕوانینە وا لە مسوڵمان دەکات بە ویژدانەوە سـەیری هـەر یاسـایەکی تـری مرۆڤکـرد بکـات ئەگەر هاتوو هەوڵی دەستەبەرکردنی دادگەریدا لە کۆمـەڵگادا، هـەتا ئەگـەر هـاتوو

---

1 . الصنعاني، محمد بن اسماعيل الأمير، سبل السلام، تحقيق: محمد عبدالعزيز الخولي، بيروت، دار إحياء التراث العربي، ط٤، ١٣٧٩، ج٣، ص٢، وراجع : ابن رشد،الوليد، بداية المجتهد ونهاية المقتصد، بيروت، دار الفكر، بدون تأريخ، المجلد الثاني، ص٤٣.

٢ . محمد بن اسماعيل الصنعاني، سبل السلام في شرح بلوغ المرام من أدلة الأحكام، تحقيق: محمد عبدالعزيز الخولي، بيروت، دار إحياء التراث العربي، ط٤، ١٣٧٩، ج٣، ص٢٢٧.

3 . هەمان سەرچاوە.

4 . هەمان سەرچاوە.

سەرچاوەکانیش نائیسلامیی بوون، چونکە دادگەریی خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو یاساکانە.

## جیاکردنەوەی ڕێگاکانی بەدیهێنان لە ئامانجەکان

شێخ محەمەد غەزالی ـ ڕەحمەتی خوای لێبێت ـ جیاوازیی کردووە لەنێوان ڕێگاکانی بەدیهێنان (الوسائل) و ئامانجەکان (الغایات)دا، ڕوونیکردووەتەوە لە کاتێکدا ماوەی میکانیزم و ڕێگاکان بەسەر دەچێت و دەگۆڕێن ئەوا ئامانجەکان کۆتاییان نایەت، بۆ ئەو بابەتەی ناوینــاوە "کۆتاییهاتنی حوکم" نموونەی "سیستمی دەسکەوت ـ نظام الغنائم" دەهێنێتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە غەنیمەت لە دەقی ڕاستەخۆی ئایەتەکانی قورئاندا هاتووە بەڵام دەکەوێتە بازنەی "ڕێگا گۆڕاوەکان"ەوە[1].

هەروەها هەردوو شێخ یوسف قەرزاوی و فەیسەڵ مەولەوی لەمدواییەدا هەستان بە فراوانکردنی گرنگیدان بە "جیاکردنەوەی ڕێگاکان لە ئامانجەکان" لە میانەی ئەو ڕاگۆڕینەوانەی کە ڕوویدا لە ئەنجوومەنی ئەورووپی بۆ فتوا و توێژینەوە دەربارەی سەرەتای مانگی ڕەمەزان لە ئەوروپا، هەردووکیان هەمان بیرۆکەیان جێبەجێ کردووە کە بریتییە لەوەی بینینی مانگ لە ڕەمەزاندا تەنها ڕێگایەکە یان میکانیزمێکە بۆ دڵنیابوون لە چوونە ناو مانگێکی نوێوە نەک ئامانجێك بێت لە خودی خۆیدا، لەمەوە گەیشتنە ئەوەی کە لێکدانەوە گەردوونییەکان ئەمڕۆ ڕێگاگەلێکی گونجاوترن بۆ چارەسەری کێشەی کەمینە مسوڵمانەکان لە پرسی

---

[1] . الغزالي، السنة النبوية بين أهل الفقه وأهل الحديث، ط١١، القاهرة، دار الشروق، ١٩٩٦، ص١٦١.

دیارییکردنی سەرەتا و کۆتایی ڕەمەزان[1]، هەروەها شێخ یوسف قەرزاوی هەمان بیرۆکەی جێبەجێ کردووە لەسەر (پەچە ـ الجلباب)ی ئافرەتی مسوڵمان، کاتێك وایداناوە پەچە میکانیزمێکە بۆ بەدیهێنانی شکۆ (العفة) نەك خۆی لە خۆیدا ئامانجێکی نەگۆڕ بێت[2].

وەکو دیارە بەڕوونی کردنەوەی دەرگای "جیاکردنەوەی ڕێگاکان لە ئامانجەکان" بوارێکی فراوان دەکاتەوە بۆ ڕاوبۆچوونی نوێ و ڕەسەن لە هەمانکاتدا لە یاساداناني ئیسلامیدا، دکتۆر تەها جابر عەلوانی بۆ نموونە هەستاوە بە پێشنیارکردنی پرۆژەیەك بۆ چاکسازییکردن لە فیکری ئیسلامیدا لە دووتوێی کتێبەکەیدا "چاکسازیی لە فیکری ئیسلامیدا"، تیایدا تێڕوانینی خۆی ڕاناوە دەربارەی پرسی جیاوازیی کردن لە نێوان میکانیزم و ئامانجەکاندا لە بابەتێکی زۆر گرنگدا ئەویش پرسی یەکسانیی لە نێوان نێر و مێدا لە شایستەیی یاساییدا (الأهلیة القانونیة)، ئەو نووسیوویەتی:

قورئانی پیرۆز خەڵکیی گواستووەتەوە لەسەردەمی دابەزینی پەیامەکەیدا بۆ بڕوابوونی تەواوەتی بە یەکسانیی هەردوو ڕەگەز، ئەم بەندە بەتایبەتی پەیوەستە بە بەندەکانی دینەوە زۆر زیاتر لەهەر بەندێکیتر، بریتیبوو لە شۆڕشێکی گرنگ کە زۆر کەمتر نەبوو لە شۆڕش دژی بتپەرستیی،..... لە کۆمەڵگای ئیسلامیی یەکەمدا بە لەبەرچاوگرتنی دابونەریتە کۆنەکان کە ڕەگ و ڕیشەیان لە دوورگەی عەربی داکوتابوو و بە لەبەرچاوگرتنی هەڵوێست و نەریتە وەرگیراوەکان لە جاهیلیەتەوە، پێویستبوو کە ئەم گۆڕانکارییانە بە قۆناغ جێبەجێ بکرێن، تاکو کۆمەڵگا بتوانێت

[1] . محاورة شفهية، سراييفو، البوسنة، أيار/مايو، ٢٠٠٧، الجلسة الدورية الثامنة عشرة للمجلس الأوروبي للفتوى والبحوث.

[2] . انظر مقال القرضاوي في كتاب: محمد سليم العوا، محررا: مقاصد الشريعة الإسلامية: دراسات في قضايا المنهج ومجالات التطبيق، القاهرة، مؤسسة الفرقان للتراث الإسلامي، مركز دراسات المقاصد، ٢٠٠٦، صفحات ١١٧ – ١٢١.

ئەم گۆڕانکارییانە هەرس بکات بە پێی گونجان لەگەڵیاندا.... کاتێك ئیسلام دانینا بـە شـاهێدیدانی ئـافرەت لـە ڕێککەوتننامەکانـدا کـە کارێـك بـوو لـە کـاتی هـاتنی ئیسلامدا ئافرەتان ڕۆڵێکیان نەبوو تیایدا شایانی باس بێـت، قورئـان مەبەسـتیبوو ڕۆڵی ئافرەت بچەسپێنێ وەکو هاوبەش و هاوشانی ژیان..... ئامانج لەمـە کۆتـایی هێنـان بـوو بـە ڕۆڵـە تەقلیدییەکـەی ئـافرەت، ئەمـەش بـەوەی کـە ئـەم ئایەتـە بیانگرێتەوە (مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ) (البقرة:٢٨٢).... بەڕاستی هێنانەناوەوەی ئافرەت بۆ ڕیزی شایەتیدەران میکانیزمێك بـوو بـۆ بـەدیهێنانی ئامانجێـك، یـان بـا بڵێین ئەمە ڕێگایەك بووە بۆ دامەزراندنی بیرۆکـەی یەکسانی هـەردوو ڕەگەزەکـە، بەڵام هەڵوێستی ڕاڤەکارانی قورئان دەربارەی (أَنْ تَـضِلَّ إِحْـدَاهُمَا فَتُـذَكِّرَ إِحْـدَاهُمَا الأُخْـرَى) (هـەمان ئایـەت)، ئەوەیـە وایـان دانـاوە کـە شـایەتیدان لـە نێـوان دوو ئافرەتەکەدا دابەش دەکرێت، ئەمەش نایەکسانی دەگەیەنێت لەگەڵ پیاواندا وەکو بنەمایەکی سەرەکیی، ڕاڤەکارانی کۆن و نوێ ئـەم بیرۆکەیـەیان وەرگرتـووە بۆیـە نـەوە لـەدوای نـەوەی مـسوڵمانان بـەردەوامییان بـەم تێگەیـشتنە داوە، لەمەشـدا تـەنها چـاولێکەرییان کـردووە لەگـەڵ ئـەوەدا کـە تێگەیـشتنێکی ناڕاسـتە، بۆیـە بێگومان ئەم هەڵوێستە کە لەم تێگەیشتنەوە سەرچاوەی گرتووە، پەڕیوەتەوە بۆ ئەودیوو فیقهیش بەشێوەیەکی بەربڵاو....[1].

نزیك لەم تێزەوە ئایەتوڵڵا مەهدی شەمسەدین پێشنیار دەکات کـە شـەرعزانان ئەمڕۆ تێڕوانینێکی دینامیکیان هەبێت بۆ تێگەیشتنی قورئان و سوننەت، نابێت وا سەیری هەر ئایەتێك لـە ئایەتـەکانی قورئـان بکـەن کـە یاسـا و حـوکمی کۆتـایی و گـشتگیرە، بـەڵکو دەبێـت عـەقڵیان بکەنـەوە بـۆ گریمانـەی ئـەوەی ئـەم یاسـایە لەوانەیە پێوەست بێت بـە هەلومـەرجێکی دیـاریکراوەوە، نابێـت وا حـوکم بەسـەر

[1] . طه جابر العلواني، قضايا في الفكر الإسلامي المعاصر، لندن-واشنطن،: المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ٢٠٠٥، صفحات ١٦٤-١٦٦.

فەرموودەکاندا بدەن کە ئەو بۆنە و هەلومەرجانەی تیایدا وتراوون ڕەهان لەڕووی کات و شوێن و هەلومەرج و کەسەکانەوە[1]، هەروەها ئایەتوڵڵا شەمسەدین درێژەدەدات و دەڵێت لەگەڵ ئەوەشدا کە پشتڕاستی ئەم تێگەیشتنە دەکاتەوە، بەڵام هیچ حوکمێکی شەرعیی بڕیار نادات لەسەر بنچینەی ئەم تێگەیشتنە لە ئێستادا، لەگەڵ ئەوەشدا جەخت دەکاتەوە لەسەر زەرورەتی وەرگرتنی ئەم بنچینەیە لە حوکمەکانی تایبەت بە ئافرەت و بواری دارایی و جیهاد[2].

نموونەیەکی تر ئەوەیە کە دکتۆر فەتحی عوسمان پێی هەستاوە لە "پێداچوونەوەی لایەنە زانستییەکان"دا کە لەو میانەیەدا شایەتیدانی ئافرەت وەکو پیاو هەژمار نەکراوە، هەروەکو ئایەتی (٢٨٢)ی سورەتی بەقەرە دووپاتیدەکاتەوە، بۆیە فەتحی عوسمان هەستاوە بە سەرلەنوێ خوێندنەوەی ئەم ئایەتە بەشێوەیەك کە بگونجێ لەگەڵ ئەو لایەنە زانستییانەدا، بەتەواوی هەروەکو شێخ عەلوانی کردوویەتی وەکو لە باسی ئەو ئایەتەدا هێنامان پێشتر[3]، بەڵکو دکتۆر حەسەن تورابی هەمان ڕای هەیە دەربارەی حوکمەکانی تایبەت بە فیقهی ئافرەت و جلوبەرگی[4].

هەروەها ڕۆجێ گارودی ـ ڕەحمەتی خوای لێبێت ـ هەمان بیرۆکەی دووپات کردووەتەوە کە قورئان "دەکرێ دابەش بکرێت بۆ دوو بەش: بەشێکی دەکرێ

---

١ . شمس الدين، آية الله مهدي، الاجتهاد والتجديد في الفقه الإسلامي، بيروت، المؤسسة الدولية، ١٩٩٩، ص١٢٨.

٢ . هەمان سەرچاوە.

٣ . الأفندي، عبدالوهاب، محرراً، إعادة التفكير في الإسلام والحداثة، مقالات في ذكرى فتحي عثمان، لندن، المؤسسة الإسلامية، ٢٠٠١، ص٤٥.

٤ . حسن الترابي، تمكين المرأة: وجهة نظر إسلامية، Emancipation of Women: An Islamic Perspective ، ط٢، لندن، مركز المعلومات الإسلامية، ٢٠٠٠، ص٢٩، ومحاورة شفهية، الخرطوم، السودان، آب/أغسطس، ٢٠٠٦.

مێژوویی بێت"، نموونەشی بۆ ئەمە حوکمەکانی تایبەت بە ئافرەتە، بەشێکیتریش بریتییە لە "بەها نەمرەکان کە تیایدا هاتوون"[1]، هەروەها عەبدولکەریم سرووش قورئان دابەش دەکات بۆ دوو بەش: "بەشی نەگۆڕەکان و بەشی گۆڕاوەکان، گۆڕاوەکانیش لەگەڵ ژینگەی کلتووری و کۆمەڵایەتی و مێژووییدا دەگۆڕێن"[2].

بەڵام، گرنگە لێرەدا بزانین بەشێك لەو نووسەرانەی کاریگەری فەلسەفەی هاوچەرخی ڕۆژئاوایان لەسەرە زۆرتر بیرۆکەی سنووردارکردنی حوکم بە هەلومەرجی مێژووییەوە پەسەند دەکەن ئەو مێژووەی حوکمەکەی دەرچووە، ئەمانە پێیان دەوترێت "پۆست مۆدێرنە مێژووییەکان"، ئەو بیرە بەسەر قورئان و فەرموودەدا جێبەجێ دەکەن بەشێوەیەك دەبێتە هۆی نەسخکردنەوەی سەرلەبەری حوکمەکانی قورئان و سوننەت و نەگەڕانەوە بۆ سەروەری و دەسەڵاتیان، ئەم هەڵوێستەی کە "مێژوویەتی" قورئان و سوننەت تەبەننی دەکات، دەڵێ بیری ئێمە دەربارەی کتێبەکان و کلتوورەکان و ڕووداوەکان بە تەواوی پێوەستە بە شوێن و جێگەی ئەو کتێب و کلتوور و ڕووداوانە لە هەلومەرجە مێژووییە دیاریکراوەکانیاندا و پێوەستە بە گەشەکردنی مێژووییان[3]،

---

[1] . روجيه غارودي، الإسلام والقرن الواحد والعشرون: شروط نهضة المسلمين، ترجمة كمال جاد الله، القاهرة، الدار العالمية للكتب والنشر، ١٩٩٩، صفحات١١٩،٧٠.

[2] . سروش، عبدالكريم، "تطوّر وتدنّي المعرفة الدينية" في كتاب الإسلام اللبرالي: كتاب مرجعي Libreal Islam: A Sorcebook ، تحرير تشارلز كيرزمان، أكسفورد: مطبعة جامعة أكسفورد، ١٩٩٨، ص٢٥٠.

[3] . تيلر، محرراً، موسوعة ما بعد المعاصرة، ص ١٧٨، فريدريك ماينيكي، التأريخانية: بزوغ النظرة التأريخية الجديدة، ترجمة: جيه إي أندرسون، لندن، ١٩٧٢.

هــەروەكو ئــەوەی قورئــان "بەرهــەمێكی كلتــووریی" بێــت ئــەو كلتــوورەی تیایــدا دەركەوتووە بەرهەمی هێنابێت، بە پێی بانگەشەی هەندێك نووسەر[1].

بەڵام بەپێی ئەم تێڕوانینە قورئانی پیرۆز دەبێتە "بەڵگەنامەیەكی مێژوویی" و تەنها یارمەتیدەر دەبێت بـۆ تێگەیـشتن لـە كۆمەڵگایـەكی مێـژوویی دیـاریكراو كـە لەسەردەمی پێغەمبـەردا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) هـەبووە[2]، هـەر ئەمەشـە یەكێكی وەكو (هایدە موغیسی) بانگەشەی بـۆ دەكـات كاتێـك دەڵـێ: "شـەریعەت ناگونجــێ لەگــەڵ بنــەمای یەكــسانی نێــوان مرۆڤەكانــدا"[3]، هــەروەها دەڵــێ: "هەرچـەندێك لـە دەقـەكان و تەئویلكردنیـشیان وەرگـرین بـەس نییـە بـۆ ئـەوەی فــەرمان و ئاڕاســتەكردنەكانی قورئــان دەربــارەی مــافی ئافرەتــان و ئەركــەكانیان بگونجێنین لەگەڵ یەكسانی هەردوو ڕەگەزەكەدا"[4]، هەروەها ئیبنـو وەرراق نزیـك لە بۆچوونی موغیسیەوە بانگەشەی ئەوە دەكات مافی مرۆڤ لـە ئیـسلامدا "بەشـی پێویستی تیانییە بۆ بەهێزكردنی بنەمای ئازادیی"[5]، ئیبراهیم موساش دەربـارەی

---

[1] . أبو زيد، "صفات الله تعالى في القرآن"، في كتاب الإسلام والمعاصرة: استجابة المثقفين المسلمين، تحرير: جون كوبر، رونالد إل. نيتلر، ومحمد محمود، لندن، آي بي توريس، ص١٩٩، محمد أركون، "إعادة التفكير بالإسلام اليوم"، في كتاب الإسلام الليبرالي: كتاب مرجعي، تحرير: تشالز كيرزمان، أكسفورد، مطبعة جامعة أكسفورد، ١٩٩٨، ص٢١١.

[2] . أبو زيد، نصر حامد، الإمام الشافعي وتأسيس الأيديولوجية الوسطية، ط٣، القاهرة، مدبولي، ص٢٠٩، إبراهيم موسى، ديون وهموم الإسلام النقد، في "المسلمون التقدميون" تحرير أوميد صافي، أكسفورد: وان ويرلد، ٢٠٠٣، ص١١٤.

[3] . موغيسّي، هايدا، النسوية والأصولية الإسلامية: حدود تحليل مابعد المعاصرة، نيويورك، زيد بوكس، ١٩٩٩، ص١٤١.

[4] . هەمان سەرچاوە.

[5] . ابن ورّاق، "الردة وحقوق الإنسان"، في "الاستكشاف الحر" شباط/ فبراير، آذار/مارس، ٢٠٠٦، بدون تأريخ، ص٥٣.

ئەمە دەڵێت فیقهی ئیسلامیی ناکرێ ببێتە بەڵگەی "تێڕوانینی ئەخلاقی" بەمانای نوێی ئەم دەستەواژەیە[1].

بەڵام من پێموایە وتنی ئەوەی قورئان "نادادگەرە" یان "نائەخلاقییە" دژی ئەو بڕوابوونەیە کە دەبێ بەکتێبی خوا هەمانبێت، لەبەرامبەر ئەمەشدا پێموایە هەندێك ڕووداوی مێژوویی و هەندێك فەرمانی فیقهی دیاریکراو لە قورئاندا دەبێت لە چوارچێوەی سیاقی کلتووری و جوگرافی و مێژوویی پەیامی ئیسلامدا سەیربکرێن، دەگەڕێینەوە و جارێکیتر دەڵێین کلیلی تێگەیشتنی ئەم دەقانە ئەوەیە جیاوازیی بکەین لەنێوان میکانیزمە گۆڕاوەکان و بنەما و ئامانجە نەگۆڕەکاندا، دەکرێ میکانیزمەکان (الوسائل) کۆتاییان بێت، بەپێی دەربڕینی شێخ غەزالی، بەڵام ئامانج و بنەماکان هەرگیز گۆڕانیان بەسەردا نایەت، ئەم تێگەیشتنەش بۆ لایەنە جاوازەکان وامان لێدەکات دەقە دامەزراوەکانی قورئان لەهەموو کات و شوێنێکدا جێبەجێ بکەین.

## مەبەستەکان و ڕاڤەی بابەتییانە بۆ قورئانی پیرۆز

بزووتنەوەی "ڕاڤەی بابەتییانە ـ التفسير الموضوعي" هەنگاوی باشی ناوە بەرەو ئەوەی ناوببنرێت ڕاڤەی مەبەستییانەی قورئانی پیرۆز (التفسير المقاصدي)، خوێندنەوەی بابەتییانەی قورئانی پیرۆز لەسەر بنەمای ئەوە دادەمەزرێت کەوا سەیری قورئان بکرێت "پێکهاتەیەکی تێروتەواوە"[2]، لەسەر بنچینەی ئەم تێڕوانینە گشتگیرە "ئایەتەکانی ئەحکام" کە چەند سەد ئایەتێك

---

[1] . إبراهيم موسى، "تعريف" في كتاب "النهضة والإصلاح في الإسلام: دراسة للأصولية الإسلامية بقلم فضل الرحمن" تحرير: إبراهيم موسى، أكسفورد، واين ويرلد، ٢٠٠٠، ص٤٢.

[2] . حسن الترابي، التفسير التوحيدي، ط١، المجلد الأول، لندن، دار الساقي، ٢٠٠٤، ص٢٠، حسن محمد جابر، المقاصد الكلية والاجتهاد المعاصر ـ تأسيس منهجي وقرآني لآلية الاستنباط، ط١، بيروت، دار الحوار، ٢٠٠١، ص٣٥.

دەبێت شەرعزانان ئەم ناوەیان بۆ داناوون، بازنەکەیان فراوان دەبێت و بەپێی ئەم تێڕوانینە نوێیە هەموو قورئانی پیرۆز دەگرێتەوە، ئەو ئایەت و فەرموودانەی باس لە عەقیدە یان چیرۆکی پێغەمبەران (علیهم السلام) یاخود ڕۆژی دوایی یان بوونەوەر دەکەن، هەموویان دەبن بە بەشێك لەچوارچێوە گشتییەکە، بەمەش ڕۆڵیان دەبێت لە دارشتنی حوکمە فیقهییەکاندا بە هەمان شێوەی ئایەتەکانی ئەحکام، ئەم ڕێگایەش بوار دەڕەخسێنێت بۆ بنەما و بەها ئەخلاقییەکان، ئەمانەش گرنگترین ئەو بابەتانەن کە چیرۆکە قورئانییەکان و بابەتەکانی ڕۆژی دوایی جەختیان لەسەر دەکەنەوە کە ببن بە بنچینەی حوکمە فیقهییەکان، شان بەشانی ڕێگە تەقلیدییەکانی چەسپاندنی حوکمە فیقهییەکان.

هەمان ئەو مەنهەجەی باسمان کرد بۆ تەفسیرکردنی بابەتییانەی قورئانی پیرۆز بەسەر فەرموودە پیرۆزەکانیشدا جێبەجێ دەکرێت، بەشێوەیەك سەیری فەرموودە بکرێت لەسەر بنچینەی بابەتەکان لەچوارچێوەی ڕوانینی گشتی بۆ دەقەکان و تێگەیشتنی ژیانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لەڕووی مەبەستەکانەوە، ئەم ڕێگایە وا لە توێژەر دەکات پرسیار بکات لە ڕاستی و دروستیی هەر فەرموودەیەك کە لەگەڵ بەها و بنچینە ئیسلامییە ئاشکراو ڕوونەکان یەك نەگرێتەوە، هەروەها ئەگەر شەرعزانان نەگەیشتنە یەکخستنێك لەنێوان دوو فەرموودەدا ئەوا ئەوەیان هەڵدەبژێررێت کە زیاتر لەگەڵ بنەماکانی قورئاندا گونجاوترە، ئەمە ژمارەیەك لە زانایانی هاوچەرخ وتوویانە[1]، ئەمەش بە

١ . بۆ نموونە سەیری ئەمانە بکە: العلواني، طه جابر، مدخل إلى فقه الأقليات، ورقة قدّمها إلى المجلس الأوروبي للفتوى والبحوث، دبلن، في كانون الثاني/ يناير، ٢٠٠٤، ص٣٦، والغزالي، السنة النبوية، صفحات، ١٩، ١٢٥، ٦١، والغزالي، نظرات في القرآن، ص٣٦، وعبدالمنعم النمر، الاجتهاد، القاهرة، دار الشروق، ١٩٨٦، ص١٤٧، وحسن الترابي، قضايا التجديد: نحو منهج أصولي، بيروت، دار الهادي، ٢٠٠٠، ص١٥٧، ياسين داتون، أصول القانون الإسلامي: القرآن، الموطّأ وعمل أهل المدينة، ساري، كيرزون، ١٩٩٩، ص١، وجون مقدسي، " اختبار على ضوء الواقع للإستحسان كأصل من أصول

واتـــای ئەوەیـــە بـــۆ ســـەلماندنی ڕاســـت و دروســـتی "ناوەڕۆکێـــك - مـــتن"ی فەرموودەیەکی پیرۆز، پێویستە زانای شـەرعزان گرنگیـی بـدات بـە گونجـانی ئـەو فەرموودەیە لەگەڵ بنەما ئیسلامییەکاندا.

لە کۆتاییدا دەڵێین مەنهەجی بنیاتنراو لەسەر مەبەستەکان دەکرێ بۆشاییەکی سـەرەکی پڕبکاتـەوە لـە گێڕانـەوەی فـەرموودەدا بەشـێوەیەکی گـشتی، ئـەویش بۆشـایی نـەبوونی بۆنـە و سـیاقە (المناسـبة والـسیاق)، زۆرینـەی فـەرموودە پیرۆزەکان لـە کتێبـە جۆراوجۆرەکـانی فـەرموودەدا لـە ڕسـتەیەك یـان دوو ڕسـتە پێکهاتوون، یاخود وەڵامـی پرسـیارێك یـان دوو پرسـیارن، بەشـێوەیەکی ئاسـایی فەرموودە هیچ سیاقێکی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایـەتی و ئـابووری و ژینگـەیی لەخۆی ناگرێ کە ئەو فەرموودەیەی تیا وتـراوە، ڕاسـتە هەنـدێك لـە هـاوەڵان یـان گێڕەرەوەکان جاری وا هەیە وتوویانە "نازانم کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسـەر بێت) ئەمەی فەرمووە مەبەستی ئەوە یان ئەوە بووبێت..." بـەڵام ئەمـە تـەنها لـە ژمارەیەکی کەم لە فەرموودەدا هاتووە کە لەگەڵ دەقـی فەرموودەکـەدا بۆنەکـەی باسـکرابێت یـان چـۆنیەتی وەرگرتنـی لەلایـەن هاوەڵانـەوە یـاخود چـۆنیەتی جێبـەجێکردنی، بـەڵکو ئەمـە جێهێڵـراوە بـۆ لێکدانـەوەی ڕاوی یـان شـەرعزان، تێڕوانیی گشتگیرانە بێگومان یارمەتیمان دەدات بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم کەلێنـە لە کەمی زانیاریی پێویست بـۆ تێگەیـشتنی ئـەوەی گـشتییە و ئـەوەی تایبەتییـە، ئەمەش بە تێگەیشتن لە مەبەستە شەرعییەکان دێتەدی.

---

الاجتهاد الإسلامي"، في مجلة القانون الإسلامي والشرق أوسطي، عـدد٩٩، (الخريـف/الـشتاء) ٢٠٠٣، وإيه أموتوشو، مشكلة الأمر في أصـول الفقـه، رسـالة دكتـوراه، جامعـة أدنـبرة، ١٩٨٤، لـؤي صـافي، إعمـال العقـل، بيـسبيرغ، دار الفكـر، ١٩٩٨، ص١٣٠، شمـس الـدين، الاجتهـاد والتجديـد في الفقـه الإسلامي، ص٢١.

## تێگەیشتنی مەبەستەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)

هەروەها زیاتر لەمەش دەکرێ مەبەستەکانی خودی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بەکاربهێنرێ بۆ دانانی فەرموودە تایبەتەکان لە سیاقی خۆیاندا، پێشتر ڕوونمان کردەوە چۆن قەڕافی جیاوازی کردووە لەنێوان کردەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە دادوەریی و فتواودان و پێشەوایەتیدا، قەڕافی ئەوەشی ڕوونکردووەتەوە کە هەریەکێك لەم ڕۆڵانەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لێکەوتە و کاریگەریی خۆی هەبووە. دواتر ئیبنو عاشوور چەند لایەنێکی تری زیاد کرد بۆ "مەبەستەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)" کە ئەم بۆچوونەی قەڕافی فراوانتر کرد، ئەمەش کۆمەڵێك مەبەست و "حاڵ"ی تایبەتی پێغەمبەرن (دروودی خوای لەسەر بێت) کە ئیبنو عاشوور هێناونی[1]:

١ـ مەبەستی یاسادانان: یەکێك لە نموونەکانی مەبەستی یاسادانان لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە میانەی حەجیماڵئاواییدا بوو، کاتێك فەرمووی: "خذوا عنّي مناسككم" (واتە تێبینی من بکەن چی ئەکەم لەکاتی حەجکردندا وەکو خۆی بیکەنەوە و شوێنم بکەون)، نموونەی ئەم کارانە دەبێ وەکو خۆیان ئەنجام بدرێن.

٢ـ مەبەستی فتواودان: نموونەی ئەم مەبەستەش فتوادانەکانی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێت) لە کاتی حەجی ماڵئاواییدا، بۆ نموونە پیاوێك هات بۆلای و وتی: پێش ئەوەی بەردباران بکەم حەیوانم سەربڕی"، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرموو: "بەردباران بکە و کێشەی تیا نییە"، دواتر پیاوێك هات و وتی: "قژم بڕی پێش ئەوەی حەیوان سەربڕم"، ئەویش پێی فەرموو: "ئێستا سەریبڕە و کێشە نییە"، ڕاوییەکە درێژە بە باسەکە دەدات و دەڵێت لەو ڕۆژەدا هەر پرسیارێکی لێکرابێت دەربارەی پێشخستن و دواخستنی

---

[1] . ابن عاشور، مقاصد الشريعة الإسلامية، الفصل السادس.

هەر شتێك فەرموویەتی "بیکە کێشەکی تیا نییە"، نموونەی ئەم فەرموودەیە پێویستە شوێنی بکەوین وەکو خۆی، ئینجا ئەوەی بە مەبەستی فتوادان کردوویەتی بەکەڵکە بۆ حوکمدان و یاسای فتوادان بەگشتی نەك تەنها ئەو کارە دیاریکراوەی کە کراوە، هەر لەو نموونەیەی کە هێنامانەوە موفتی فێردەبێت کە ریزبەندی لە ئەنجامدانی کارەکانی حەجدا پێویست نییە تەنها ئەوە نەبێت کە دەقێکی ڕاستەوخۆی لەسەر هاتبێت.

٣- مەبەستی دادوەریی: ئیبنو عاشوور ئەم نموونانەی خوارەوەی هێناوەتەوە لەسەر ئەم مەبەستە: (١) دادوەرییکردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لەنێوان پیاوێك لە حەزرەمەوت و پیاوێك لە کیندە دەربارەی کێشەیان لەسەر پارچە زەوییەك. (٢) حوکم و دادوەرییکردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لەنێوان عەرەبێکی دەشتەکی و کەسێکی تردا کاتێك عەرەبە دەشتەکییەکە هات و بۆلای و وتی: دادوەریی بکە لە نێوانماندا پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: "بەدڵنیاییەوە دادوەری لەنێوانتاندا دەکەم". (٣) دادوەریی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لەنێوان حەبیبە و سابیتدا، کاتێك حەبیبەی کچی سەهل هات حاڵی خۆی لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕوونکردەوە کەوا مێردەکەی خۆش ناوێت و دەیەوێ لێی جیاببێتەوە، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرموو: ئایا باخەکەی بۆ دەگێڕیتەوە؟ حەبیبەش وتی: نەك هەرئەوە بەڵکو بڵێێ هەرشتێکی ئەوت لایە، بەمشێوەیە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بڕیاریدا کە سابیت باخەکەی وەرگرێتەوە و تەڵاقی بدات. ئەم جۆرە فەرموودانە یاسای گشتی نین و مەبەست لێیان یاسادانان نەبووە هەروەکو قەڕافی ڕوونی کردووەتەوە، بەڵکو فەرمان دەرکردن و دادوەرییکردن بەپێی ئەو ئیجتیهاد و ئەنجامە دەبێت کە دادوەر پێی دەگات بەپێی کێشەکە.

٤ ـ مەبەستی سەرکردایەتیکردن (واتە ڕۆڵی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) وەکو فەرمانرەوای مسوڵمانان): نموونەی ئەمەش ڕێگەدانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بە خاوەنداریێتی هەر پارچە زەوییەك کە فەرامۆشکراوە لەلایەن ئەو کەسەوە کە دووبارە زیندووی دەکاتەوە، ڕێگری لە خواردنی گۆشتی سوور لە شەڕی خەیبەردا، هەروەها وتەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لەمیانەی شەڕی (حونەین)دا: "هەرکەسێك کەسێکی کوشت و شاهیدی هەبوو کە ئەو کەسە بەدەستی ئەو کوژراوە، ئەوا بۆی هەیە هەموو شتەکانی کوژراوەکە بۆ خۆی ببات"، یاسای گشتی ئەوەیە ئەو فەرموودانەی دەربارەی بابەتە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان وتراون دەبێت لە ڕوانگەی مەبەستە باڵاکانەوە سەیر بکرێن بەشێوەیەك بەرژەوەندیی گشتی دەستەبەر بکەن.

٥ ـ مەبەستی ڕێنمایی کردن (ئەمەش لە یاسادانان فراوانترە): لێرەدا فەرموودەیەکمان هەیە کە بوخاری گێڕاویەتیەوە دەڵێ: "بە ئەبوزەڕ گەیشتم مێردمنداڵێکی لەگەڵدا بوو بەندەی بوو و عەبایەکی بەسەر شانەوە بوو، پێموت: ئەمە چییە ئەبوو زەڕ؟ وتی: وەرە باپێت بڵێم: من قسەی ناشرینم بە بەندەکەم وت و تانەم لێدا بەهۆی دایکیەوە، ئەویش شکاتی لێ کردم لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرمووم: ئایا تانەو تەشەرت لێداوە بەهۆی دایکیەوە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: تۆ پیاوێکی هێشتا نەفامیت تیا ماوە، بەندەکانتان بەخششی خوان بۆ ئێوە"، لەم فەرموودانەوە ڕێنوێنی و ئامۆژگاریی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەبینین لە مامەڵەکردنی هاوەڵانی تایبەت لەگەڵ بەندەکاندا.

٦ ـ مەبەستی نێوەندگیریی: نموونەی فەرموودەیەك ئەمە ڕوون بکاتەوە فەرموودەی بورەیرەیە، تیایدا هاتووە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) داوای لە بورەیرە کردووە بگەڕێتەوە لای مێردەکەی دوای ئەوەی تەڵاقیداوە، بورەیرەش وتوویەتی: "ئایا فەرمانم پێدەکەی ئەی پێغەمبەری خوا ؟(دروودی

خوای لەسەر بێت)؟ فەرموویەتی: "نەخێر، بەڵکو داوادەکەم" ئـەویش وتوویـەتی: "من هیچ پێویستیەکم پێی نییە"، هەروەها بوخاری فەرموودەیەکیتر دەگێڕێتـەوە دەکرێ نموونەیەکیتر بێـت لەسـەر ئەمـە کاتێـك بـاوکی جـابر مـرد جـابر داوای لـە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) کرد قسە لەگەڵ خاوەن قەرزەکانیـدا بکـات تا لە بەشێك لە قەرزەکانیان خۆشبن، پێغەمبەریش (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) قـسەی لەگـەڵا کـردن، بـەڵام ڕازی نـەبوون، پێغەمبـەریش (دروودی خـوای لەسـەر بێت) لاری نەبوو و لێی قبـوڵکردن، هـەروەها فەرموودەیـەکی تـر هەیـە دوربـارەی نێوەنـدگیریی تیایـدا هـاتووە کـەعبی کـوڕی مالیـك داوای قـەرزێکی کـردەوە لـە عەبدوڵڵای کوڕی حەدرەد کە لەسەری بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێـت) داوای لە کەعب کرد کە لە نیوەی خۆش ببێـت کـەعبیش ڕازیبـوو، لـە هـەموو ئـەم فەرموودانەدا هاووەڵان وا تێگەیشتوون کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسـەر بێـت) مەبەسـتی نـەبووە کەسـێك پابەنـد بکـات یـان فـەرمانی بەسـەردا بکـات، بـەڵکو مەبەستی نێوەندگیریی و ڕازیکردن بووە.

٧ ـ مەبەسـتی ڕێنمـاییکردن دەربـارەی پرسـیارلێکراو: نموونـەی ئەمـەش فەرموودەکەی عومەری کوڕی خەتتابە کاتێك ئەسپێکی بە پیاوێك بەخـشی لـەڕێی خوادا، دوایی ویستی لێی بکڕێتەوە چونکە دڵنیـابوو لـەوەی پیاوەکـە دەچـێت بـە هەرزان دەیفرۆشێت، بەڵام کاتێك پرسـیاری لـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێت) کرد دەربارەی ئەمە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسـەر بێـت) پێـی فـەرموو: "نەیکڕیتەوە لێی ئەگەر بە درهەمێکیش بیفرۆشـێت، ئـەوەی لـە خێـر و بەخـشش پەشـیمان بێتـەوە وەکـو سـەگێك وایـە ڕشـانەوەی خـۆی بخواتـەوە" بـەڵام هـیچ کەسێك نازانێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەم ڕێگریکردنەی گـشتییە و بـۆ هـەموو کـەس و کاتێکـە یـان نـا. نموونەیـەکی تـر فەرموودەیەکـە (زەیـد) گێڕاویەتیـەوە تیایـدا هـاتووە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویەتی:"کڕین و فرۆشتن بە بەروبوومەوە مەکەن تا دەرنەکەوێ چۆن دەبێت

(واته پێش ئەوەی پێبگات)"، بەڵام زەید دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێ ئەمە وەکو ڕاوێـژپێکردن وابـووە کـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) پێـی فەرموون، چونکە کێشەی زۆر ڕووبەڕووی دەبووەوە لە ئەنجامی ئەمجۆرە کڕین و فرۆشتنەدا، لەم دوو ڕووداوە هاوەڵان وا تێگەیشتوون ـ وەکو خـاڵی پێـشوو ـ کـە ناچارکردنی کەسی تیا نییە دەربارەی شتێك.

٨ ـ مەبەستی ئامۆژگاری: نوعمـانی کـوڕی بەشـیر دەگێڕێتـەوە کـە بـاوکی بـە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)ی وتـووە شـتێکی بەخـشیوە بـە یـەکێك لـە کوڕەکانی، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) لێی پرسیوە: ئایا بە هـەموو کوڕەکـانیترت وەکـو ئـەو بەخـشیوە؟ ئـەویش وتوویـەتی: نـەخێر، پێغەمـەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: مەمکـە بـە شـایەتحاڵی سـتەم. لێـرەدا هیچکام لـە مالیـك و ئـەبو حەنیفـە و شـافیعی وای نـابینن کـە پێغەمبـەر (دروودی خــوای لەســـەر بێـــت) ئـــەم بەخـــشش و دیاریـیـــەی حـــەرام کردبێـــت یـــان هەڵیوەشاندبێتەوە، ئەوەی ئەمە پشتڕاست دەکاتەوە لە هەندێك ڕیوایەتدا هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی (کەسێکی تـر جگـە لـە مـن بکە بە شاهێد).

٩ ـ مەبەســتی هانــدانی نــەفس بــەرەو کــامڵبوون: ئەمــەش زۆر هەیــە لــە فەرمانەکانی پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) بـۆ هـاوەڵان بـۆ کـامڵکردنی خۆیان نەك بۆ گشتاندن بەسەر هەموو ئوممەتدا، لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لـە بــەڕائی کــوڕی عازبــەوە: "پێغەمبــەر (دروودی خــوای لەســەر بێــت) فــەرمانی پێکردووین بە حەوت شت و ڕێگریی لێکردووین لە حەوتی تر: فەرمانی پێکـردووین بەسەردانی نەخۆش و شوێنکەوتنی مردوو و وەڵامدانەوەی کەسێك کە دەپـژمێت و بەجێگەیانـدنی سـوێند و سەرخـستنی سـتەملێکراو و پەرەپێـدانی سـەلامکردن و چـوون بـەدەم بانگهێـشت کردنـەوە، هـەروەها ڕێگریـی لێکـردووین لـە مـستیلەی ئاڵتوون و قـاپ و قاچـاغی زیـو و (پارچـە قوماشـێکی سـوور کـە دەدرێت بەسـەر

پشتی ولاخدا) و لەبەرکردنی قوماشە گرانبەهاکانی وەك (استبرق) و ئاوریشم و دیباج"، هەندێك لەم فەرمانانە واجببوونیان دیارە و بڕاوەتەوە، بەڵام هەندێکیان بۆ پاراستنی هاوەڵان بووە لە خۆبەزلگرتن و دوورکەوتنەوە لە خۆڕانان.

١٠ ـ مەبەستی فێرکردنی بەها باڵاکان: نموونەی ئەمەش کاتێك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە ئەبوزەڕی پرسی: ئایا کێوی ئوحود دەبینی؟ ئەبوزەڕیش وتی: بەڵێ، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: حەزم دەکرد بەقەد ئوحود ئاڵتوونم هەبووایە و هەموویم ببەخشییایە لەو هەمووە تەنها سێ دینارم بهێشتایەتەوە"، لێرەدا مەبەستی ئەوە نەبووە ئەمە بەسەر هەموو مسوڵمانێکدا جێبەجێ بکرێت".

١١ ـ مەبەستی ڕەوشت جوانکردن (التأديب): تیایدا هەندێك لە زیادەڕۆیی هەیە بەمەستی هەڕەشەکردن وەکو ئیبنو عاشوور دەڵێت، نموونەی ئەمەش وتەی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێت) کە دەفەرموێ: "سوێند بە خوا ئیمانی نییە، سوێند بە خوا ئیمانی نییە، وتیان: کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: هەرکەسێك دراوسێکەی لە شەڕ و پیلانی دڵنیا نەبێت" مەبەست لێرەدا نەبوونی ئیمانی تەواوەتییە نەك بنچینەی ئیمان.

١٢ ـ مەبەستی خۆدامالین لە ڕێنموویی (واتە مەبەستی فێرکردن نەبووە): ئەمە پەیوەندی بە یاسادانان و دینداریی و سیستمی ئومەتەوە نەبووە، لەمانەش نەریتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە نانخواردن و جل لەبەرکردن و خەوتن و ڕۆیشتن و سواریی ولاخ، نموونەی ئەمەش وەستانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە حەجی ماڵئاواییدا لەسەر گردێك وەستابوو (لەو شوێنەدا کە وردە بەردی تیادا بوو لە مینا) دەیڕوانی بەسەر ئاوی بەنو کینانەدا، عائیشە دەربارەی ئەم شوێنە دەڵێت: مانەوە لەو شوێنە لە ڕێوڕەسمەکانی حەجکردن نەبوو، بەڵکو تەنها شوێنێك بوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) هەڵیبژاردبوو تا تیایدا بمێنێتەوە بۆ ئەوەی ئاسانتر بتوانێت بەرەو مەدینە بڕوات.

ئەم فراوانییە لە تێگەیشتنی ئیبنو عاشور بۆ ئەو فەرموودانەی هێنامانەوە، گرنگە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی تێگەیشتنمان بۆ مەبەستی دەقە شەرعییەکان، هەروەها بوارێکی فراوانتر دەڕەخسێنێ بۆ نەرمی نواندن لە تێگەیشتنی دەقەکان و جێبەجێکردنیان.

## "ئاوەڵاکردن بە هۆی ئاکامەوە" لە بەرامبەر "ڕێگریی بە هۆی ئاکامەوە" (فتح الذرائع في مقابل سد الذرائع)

"ڕێگریی لە هۆکارەکان بە هۆی ئاکامەکانیانەوە" لە فیقهی ئیسلامیدا بە واتای ڕێلێگرتن و سنووربەندکردن دێت، بۆ کارێکی ڕێگا پێدراو لە بنەڕەتدا، کە دەبێتە هۆی بەرپابوونی کاری خراپ و نابەجێ[1]، شەرعزانان لەسەر ئەوە کۆدەنگن بە جیاوازی ئاینزاکانیانەوە کە ئەو کارەی ڕێگریی لێدەکرێ بە هۆکاری ئەوەی دەبێتە هۆی ڕوودانی کارێکی ناپەسەند، دەبێت "ئەگەری ڕوودانی ئاکامی ناپەسەندی زۆرتر بێت نەك چاك" بەڵام شەرعزانان دوای ئەمە ڕاجیاییان هەیە لەسەر پۆلێنکردنی ئەو ئەگەرانە، لەمەوە ئەگەرەکانی ڕوودانی کاری ناپەسەند دابەش دەکەن بۆ (چوار) ئاست[2]:




[1] . الشوكاني، محمد بن علي، إرشاد الفحول إلى تحقيق الحق من علم الأصول، تحرير: محمد سعيد البدري،ط١، بيروت، دار الفكر العربي، ١٩٥٨، ص٢٦٨.
[2] . أبو زهرة، أصول الفقه، ص٢٧١.

ئەمە چوار ئاستن لە ئەگەری بەدیهاتنی ئاكامی ناپەسەند و خراپ بۆ كارێك كە لە بنەڕەتدا ڕێگەپێدراوە و چاكە، بێگومانی، زۆرجار، لەوانەیە، هەندێكجار.

لێرەدا چەند نموونەیەك دەهێنینەوە كە شەرعزانان باسیان كردوون بە ڕوونكردنەوەی ئەم چوار بەشە:

١ ـ زۆرێك لە شەرعزانان نموونەیەك دەهێننەوە لەسەر كارێك كە بێگومان دەبێتە هۆی زەرەرگەیاندن و ئاكامی خراپی دەبێت، ئەویش "هەڵكەندنی بیر لەسەر ڕێگای خەڵكی (واتە لەسەر ڕێگایەكی گشتی كە زەرەر بگەیەنێت)"، شەرعزانان لێرەدا كۆكن لەسەر ڕێگاگرتن لەو هۆكارەی دەبێتە هۆی ڕوودانی ئەم كارە، بەڵام جیاوازن لەوەی كە ئایا ئەو كەسەی بیرەكەی هەڵكەندووە سزادەدرێت لەسەر ئەم كردەوەیەی ئەگەرهاتو خەڵكی تووشی ئازار و ناڕەحەتی بوون؟ ناوەرۆكی ئەم جیاوازییەش ئەوەیە: ئایا ڕێگرتن لە كارێكی ناپەسەند سزادانی بكەرەكەشی دەگرێتەوە یان نا ئەگەر خەڵكی تووشی زەرەر و زیان بوون بەهۆی كارەكەیەوە؟

٢ ـ نموونەیەكی تر شاتبی هێناویەتی بۆ كارێك "هەندێك جار" دەبێتە هۆی ڕوودانی ئاكامی خراپ، ئەویش (فرۆشتنی ترێ)یە، بەوپێیەی ئەوانەی بەكاری دەهێنن بۆ دروستكردنی (مەی) ڕێژەیەكی كەمن، لێرەدا "ڕێگرتن بەهۆی ئاكامەوە" جێبەجێ نابێت وەكو شەرعزانان دەڵێن، لەبەر ئەوەی سوود و قازانجی ئەو كارە (ترێ فرۆشتن) زیاترە لە زەرەر و زیانی، بەڵكو زیانی چاوەڕوانكراو زۆر كەمە[1].

٣ ـ هەندێك لە شەرعزانان وایدەبین كە زەرەر و زیان (زۆرجار ـ غالبا) زاڵدەبێت بەسەر فرۆشتنی چەكدا لەكاتی ئاشوب و بەرپابوونی فیتنەدا (واتە لەكاتی ململانێ ناوخۆییەكاندا)، یان فرۆشتنی ترێ بە كەسێك كە (مەیفرۆش یان

[1] . الشاطبي، الموافقات، المجلد الثاني، ص٢٤٩.

مەی دروستکەر)بێت[1]، لێرەدا مالیکییەکان و حەنبەلییەکان کۆکن لەسەر ڕێگـرتن لەئاکامەکان، بەڵام شافیعییەکان و حەنبەلییەکان (ئاوا نووسراوە، بـەڵام لەوانەیـە مەبەسـتی حەنەفییـەکان بێـت) جیـاوازن لەگەڵیانـدا و دەڵـێن دەبێـت لـە زەرەر و زیانەکەی دڵنیابین (واتە ئاستی یەکەم بێت) ئینجا ڕێگریی دەکرێت لە کردنـی ئـەو کارە.

٤ ـ هەندێك لە شەرعزانان پێیانوایە کە زیان و ئاکامی خراپ (لەوانەیە ـ ئاستی سێیەم) بێتەدی کاتێك ئافرەت بەتەنیا سەفەر دەکـات، یـان کاتێـك خـەڵکی فێڵـی فیقهی (حیلە شەرعی) بـەکاردەهێنن لـەکڕین و فرۆشـتندا وەکـو ئـەوەی مامەڵـەی بازرگانی لە ڕووکەشدا ڕاست و دروست بەڵام لە ناوەڕۆکدا فێڵی شـاراوەی تیایـە و لەوانەیە سـوودی لێبکەوێتـەوە[2]، لێرەشـدا مالیکییـەکان و حەنبەلییـەکان کـۆکن لەسـەر ڕێگـرتن لـەو کارانـەی دەبنـەهۆی ئاکـامی ناپەسـەند، بـەڵام ئـەوانی تـر ڕاجیاییان هەیە لەگەڵیاندا، لەبەر ئەوەی لە ئاکامەکەی دڵنیا نین کە دەبێتە هۆی خراپە و گومانی زۆرتریش بەلای خراپەدا نییە (واتە ئاستی یەکەم و دووەم نییە).

لەم نموونانەوە کە هێنامان دەردەکەوێت کە دابەشکردنی (ڕێگاکان ـ الوسائل) و (ئاکامـەکان) و ئـەو ئەگەرانـەی پەیوەنـدی پێیانـەوە هەیـە دەگـۆڕێن، بـەپێی بارودخی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی، نەك کۆمەڵێك یاسای نەگۆڕ و چەسـپاو بن.

"ڕێگریی بـەهۆی ئاکامـەوە" بـە دەربڕینـی فەلـسەفەی ئـەخلاقی جۆرێکـە لـە حوکمدان لەسەر بنەمای ئاکام و ئەنجامی کردارەکان[3]، دەکـرێ هەنـدێجار سـوود بەخش بێت، بەڵام هەندێجاریش خراپ بەکاردەهێنرێت لەلایەن ئەوانـەی تونـدگیرن

[1] . أبو زهرة، أصول الفقه، ص٢٧٣.

٢ . هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

[3] . وولف، روبرت بول، حول الفلسفة، الطبعة الثامنة، نيوجيرسي، برنتيس ـ هول، ٢٠٠٠، ص٩٠.

و زیادەڕۆیی دەکەن، یان ئەوانەی بۆ مەبەستی سیاسی و خۆسەپاندن بەسەر خەڵکیدا پەنای بۆ دەبەن، ئەمڕۆ دەبینین چۆن "ڕێگریی بەهۆی ئاکامەکانەوە" ڕێگایەکە زۆر بەکاردەهێنرێت لە نووسینەکانی "زاهیرییە نوێیەکان"دا بەپێی دەربڕینی شێخ قەرەزاوی، بەتایبەتی لەو یاسایا و حوکمانەی تایبەتن بە ئافرەتی مسوڵمان، بۆ نموونە لەسەر بنچینەی "ڕێگریی لە ئاکامی خراپ" ئافرەت ڕێگای لێدەگیرێت سەیارە لێخوڕێت یان بەتەنیا سەفەر بکات، یان کاربکات لە ئێزگە و تەلەفیزیۆنەکان، یان بەشداریی لە پرۆسەی سیاسیدا بکات، تەنانەت لە هەندێك نووسیندا ڕێگریی لێدەکرێت بە ناوەڕاستی ڕێگادا بڕوات[1]، لێرەدا فەتوایەك دەهێنین بەتەواوی ئەوە ڕووندەکاتەوە کە مەبەستمانە لەخراپ بەکارهێنانی "ڕێگریی لە ئاکامی خراپ"، بەبێ قسە لەسەرکردن وەکو خۆی هێناومە بەئومێدی ئەوەی خوێنەر ئەو سەمەرەیەی تیا ببینێت کە من تێبینیم کردووە[2]:

پرسیار: خوازیارم حوکمی لێخوڕینی ئۆتۆمبێل لەلایەن ئافرەتەوە ڕوون بکەنەوە، ڕای ئێوە چییە لەسەر ئەوەی دەوترێت ئافرەت خۆی ئۆتۆمبێل لێبخوڕێ باشترە لەوەی لەگەڵ شۆفێرێکی نامەحرەم سوارببێت؟

ـ وەڵامی ئەم پرسیارە لەسەر ئەوە بنیات دەنرێ... هەرشتێك سەری کێشا بۆ حەرام ئەوا حەرامە... بێگومان ئۆتۆمبێل لێخوڕین لەلایەن ئافرەتەوە خراپەی زۆری هەیە، لەو خراپانەش: دانانی حیجاب، لەبەر ئەوەی ئۆتۆمبێل لێخوڕین پێویستی بە دەرخستنی دەموچاوە ئەمەش جێگای فیتنەیە، دەبێتە هۆی سەرنجڕاکێشانی پیاوان،.... لەوانەیە کەسێك بڵێ: ئافرەت دەتوانێت ئۆتۆمبێل لێخوڕێ بەبێ ئەو پەچەیەی هەیە وەکو ئەوەی دەمولوتی هەڵبەستێت و

---

[1] . وجنات عبدالرحيم ميمني، قاعدة الذرائع، ط١، جدة، دار المجتمع، ٢٠٠٠، صفحات ٦٠٨، ٢٢، ٣٢،٥٠.

[2] . كتاب الفتاوى الشرعية في المسائل العصرية من فتاوى علماء البلد الحرام، ابن عثيمين.

چاویلکەیەکی ڕەش بکاتە چاوی، بەڵام لەوەڵامدا دەڵێین ئەمە پێچەوانەی واقیعی ئەو ئافرەتانەیە کە عاشقی ئۆتۆمبێل لێخوڕینن، ... هەروەها لە خراپەکانی لێخوڕینی ئۆتۆمبێل لە لایەن ئافرەتەوە دانانی شەرم و نەمانیەتی.... دەبێتە هۆی زۆر دەرچوونی ئافرەت لەماڵ.... هەروەها لە خراپەکانی ئەوەیە ئافرەت ئازاد دەبێت بۆ هەرکوێیەك پێی خۆشبێت بچێت و کەی بیەوێ بچێت و هەرشتێکی بوێ خێرا بڕواتە دەرەوە، چونکە بەتەنیایە لە ئۆتۆمبێلەکەیدا کەی ویستی بێتەوە بۆ ماڵەوە تەنانەت تا درەنگانی شەو بمێنێتەوە.... هەروەها لە خراپەکانی هۆکارێکە بۆ هەڵگەڕانەوەی ئافرەت لەماڵ و مێردی هەر لەبەر بچووکترین شت سواری ئۆتۆمبێلەکەی دەبێت و دەڕوا تا تیایدا پشوویەك بدات.... هەروەها لە خراپەکانی دەبێتە هۆی فیتنە لە زۆر شوێن، وەکو وەستان لەلای ترافیکەکانی وەستان و لە بەنزینخانەکان... یان لەکاتی تێکچوونی شتێکی ئۆتۆمبێلەکەی لەڕێگا ناچار دەبێت دابەزێت و خەریکی بێت تا چاکی بکاتەوە، لەمکاتەدا لەوانەیە کەسێکی ڕەوشتنزم یارمەتی بدات و خۆی لێبەرێتە پێشەوە بۆ چاککردنەوەی لەسەر حسابی ئابڕووی ئافرەتەکە، ئەوکاتە دەبێ حاڵی چۆن بێت؟ .... لەخراپەکانی لێخوڕین لەلایەن ئافرەتەوە زیادبوونی قەرەباڵغی شەقامەکان، یان بێبەشبوونی هەندێك گەنجی تر لە لێخوڕینی ئۆتۆمبێل کە ئەوان شایستەترن بە لێخوڕین لە ئافرەت و باشتریشن، هەر لە خراپەکانی ئۆتۆمبێل لێخوڕین لە لایەن ئافرەتەوە زۆربوونی ڕووداوی هاتوچۆیە، چونکە ئافرەت هەر لە سروشتی خۆیدا لە پیاو کەمتواناتر و کورتبینتر و بێدەسەڵاتترە... (تا کۆتایی!!!).

لەلایەکیترەوە هەندێك لە مالیکییەکان پێشنیاری "ئاوەڵاکردن بە هۆی ئاکامەکانەوە ـ فتح الذرائع"یان کردووە بۆ ئەوەی ببێتە بەرامبەرێکی لۆجیکی بۆ

"ڕێگریی بەهۆی ئاکامەکانەوە"[1]، بۆ نموونە قەڕافی حوکمەکانی دابەشکردووە بۆ "ڕێگاکانی بەدیهێنان" و "مەبەستەکان" و پێیوایە ئەو هۆکار و میکانیزمەی دەبێتە هۆی ئەنجامێکی ناپەسەند ڕێگای لێبگیرێ، ئەوەشی دەبێتە هۆی ئەنجامی باش ئاوەڵا بکرێت[2]، لێرەدا دەبینین چۆن قەڕافی دیاریکردنی هەلومەرجی میکانیزمەکان دەبەستێتەوە بە مەبەستەکانەوە کە ئەم ڕێگا و میکانیزمانە دەبنە هۆی بەدیهێنانیان، لەسەر ئەم بنەمایەش (سێ پلە) لە مەبەستەکان دیاریی دەکات، ئەوانیش "خراپ" و "چاك" و "ناوەند"ن، هەروەها شەرعزانێکی مالیکی مەزهەبی تریش کە (ئیبنو فەرەحون)ە (ساڵی ٧٦٩ك) وەفاتی کردووە، هەمان ڕێسای قەڕافیی پێڕەو کردووە لە "ئاوەڵاکردن بەهۆی ئاکامەوە" بەسەر کۆمەڵێك حوکمی شەرعییدا[3].

| | | |
|---|---|---|
| مەبەستێکی خراپ ئەو ڕێگایانەی بەدی دەهێنن ڕێگا پێنەدراون | مەبەستی ناوەند ئەو ڕێگایانەی بەدی دەهێنن ڕێگا پێدراون | مەبەستێکی باش ئەو ڕێگایانەی بەدی دەهێنن ئاوەڵان |

[1] . القرافي، الذخيرة، المجلد الأول، ص١٥٣، القرافي، الفرقان (مع هوامشه)، المجلد الثاني، ص٦٠، برهان الدين بن فرحون، تبصرة الحكام في أصول القضية ومنهاج الأحكام، تحرير جمال مرعشلي، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٩٩٥، المجلد الثاني، ص٢٧٠.

[2] . القرافي، الذخيرة، المجلد الأول، ص١٥٣، القرافي، الفرقان، (مع هوامشه)، المجلد الثاني، ص٦٠.

[3] . ابن فرحون، برهان الدين، تبصرة الحكام في أصول القضية ومناهج الأحكام، تحرير: جمال مرعشلي، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٩٩٥، المجلد الثاني، ص٢٧٠ ومابعدها.

## جۆرەکانی مەبەستەکان و ئەو ڕێگایانەی دەبنە هۆی بەدیهاتنیان وەکو لای قەڕافی هاتووە

لێرەدا دەبینین چۆن مالیکییەکان قسەوباسیان تەنها کورت نەکردووەتەوە لەسەر لایەنی سەلبی ئاکامەکان، بەڵکو ئەم بیرکردنەوەیان فراوان کردووە بۆ ئەوەی لایەنی ئیجابیش بگرێتەوە، ئەمەش بووەتە هۆی هاندان و هەڵنان لەسەر کردنی کار و کردەوەیەك کە دەبێتە هۆی بەدیهێنانی بەرژەوەندی خەڵکی، ئەگەرچی ئەم کارانە لە دەقی دیاریکراویشدا نەبن.

## بەدیهێنانی مەبەستی "جیهانێتیی ـ العالمیة"

ئەو عورفەی شەرع ڕەچاوی دەکات و سەنگی بۆ دادەنێت واتە ئەو دابونەریتە چاکانەی کە لە کۆمەڵگادا بڵاو دەبنەوە و پەیڕەویی دەکرێن، بەڵام پەیوەندی نێوان عورف و شەرع پەیوەندییەکی قووڵترە لە تەنها ڕەچاوکردن و سەنگ بۆدانان، لە ڕاستیدا دابونەریتە عەرەبییەکان کاریگەرییەکی باڵایان هەبووە لەسەر کۆمەڵێك لە حوکمە شەرعییەکان، چ لەسەرەتاکان یان کۆتاییەکانی مێژووی ئیسلامیدا بێت، لەبەر ئەمە ئیبن عاشوور تێڕوانینێکی نوێی پێشنیار کردووە بۆ بنچینەی دابونەریت لەسەر بنەمای مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلامیی، لە کتێبەکەیدا (مەبەستەکانی شەریعەت) بەشێکی تەرخانکردووە بۆ دابونەریت و ناوی ناوە (گشتێتی شەریعەتی ئیسلام)[1]، لەم بەشەدا ئیبنو عاشوور باسی کاریگەریی دابونەریتی نەکردووە لەسەر جێبەجێکردنی فەرموودە پیرۆزەکان، هەروەکو پێشتر کراوە، بەڵکو گرنگیداوە بە کاریگەریی دابونەریتی عەرەبی لەسەر تێگەیشتنمان لە خودی فەرموودە پیرۆزەکان.

---

[1] . ابن عاشور، مقاصد الشريعة الإسلامية، ص٢٣٤.

ئیبنو عاشوور بەوە دەست پێدەکات کە توێژەر دەبێت لـە چـەمکی جیهـانێتی ئیسلامەوە دەست پێبکات، چـونکە زانایـانی ئیـسلام پێـداگریی لـەوە دەکـەن کـە ئیسلام بۆ هەموو کات و شوێنێکە و بۆ هـەموو مرۆڤایەتییـە، ئەمـەش ئایەتـەکانی قورئان و فەرموودەکان ڕوونـی دەکەنـەوە. ئـیبن عاشـوور ژمارەیـەکی لـەم دەقـە پیرۆزانـە هێنـاوە[1]، دواتـر ئیبنـو عاشـور درێـژەی بـە باسـەکە داوە و دەربـارەی حیکمەتە شاراوەکانی پـشت هەڵبـژێرانی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) لـەناو عەرەبـدا دەدوێ، یـەکێك لـەو حیکمەتانـە کـەنارگیریی عـەرەب بـووە لـە شارسـتانیەتی جیهـانیی، ئەمـەش وایکـردووە تێکـەڵاوی بـاش لەگـەڵ ئـەو گـەل و نەتەوانەدا دروست بکات ئەوانەی لەنێوان ئەوان و عەرەبدا دژایەتی نـەبووە، ئەمـە بـە پێـچەوانەی فـارس و ڕۆمـە بیزەنتییـەکان و قیبتییەکانـەوە بـووە، ئـەو دەنووسێت:

(گەورەترین شتێك کە گشتێتی شەریعەت بەرپای دەکـات ئەوەیـە حوکمـەکانی یەکسان بن بۆ هەموو ئەو گەل و نەتەوانەی شوێنی دەکەون بەپێی توانـا... لەبـەر ئەم حیکەت و تایبەتمەندییە خوای گەورە ئـەم شـەریعەتەی دامەزرانـدووە لەسـەر حیکمەت و هۆکارەکان کە پەیپێبراوی عەقڵن و ناگۆڕێن بە پێـی جیـاوازیی گـەل و نەتەوەکان.... ئێمە دڵنیـاین کـە دابونـەریتی گـەلێك ـ لەبـەر ئـەوەی دابونەریتـە ـ نـاکرێ بەسـەر گـەلێکی تـردا بـسەپێنرێ لـە یاسـادانان و بنیاتنـانی حوکمـە شـەرعییەکاندا، تەنانـەت نـاکرێ بەسـەر کەسـانی سـەر بـەو گـەل و نەتەوەیەشـدا بسەپێنرێ.... لێرەوە بۆمـان دەردەکـەوێ کـە زۆرێـك لـە زانایـان بۆچـی تووشـی سەرسوڕمان و سەراسیمەیی هاتوون سەبارەت بە ڕێگریـی شـەریعەت لـە کۆمـەڵێك

[1] . بۆ نموونە ئیبنو عاشوور ئەم دوو ئایەتە دەهێنێت: (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ {أي يـا محمـد} إلاَّ كَافَّـةً لِلنَّـاسِ) (سورة سبأ ٢٨)، (قُلْ يَأَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رِسُولُ اللَّهِ إِلَيكُم جَمِيعاً)(سورة الأعراف ١٥٨)، هەروەها ئـەم فەرموودە پیرۆزە: (كان النبـي يُرسَل إلى أمته خاصة وأُرسِلت للناس عامة) (رواه مسلم).

شت کـه هـیچ جـۆره خراپـه و فەسـادێکی تیـا نـابینین، بـۆ نموونـه حـەرامکردنی لکاندنی قژ لەلایەن ئافرەتەوە (واتە ئافرەت قژی درێژ بکات بەهۆی پێوە لکانـدنی قژێك کە هی خۆی نەبێ) یان ڕێککردنەوەی ددان یاخود کووتانی پێست.... بـەڵام لای من هۆکاری حەرامکردنی ئەم شتانە کە نەمبینیوە کەس باسی بکات، بریتییـە لەوەی ئـەم حاڵەتانـە بەڵگـەبوون لەسـەر لاوازی پاکـداوێنی و خۆپـارێزی ئـافرەت لەلای عەرەب، بۆیە ڕیگریکردن لێیان ڕێگریـی بـووە لـە هۆکـاری ئـەو شـتانە یـان هەتککردنی نـامووس و ڕەوشـتی بـەهۆی ئەمانـەوە، قورئـان دەفـەرموێت: (يَأَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِـكَ وَبَنَاتِـكَ وَنِـسَاءِ المُـؤمِنِيْنَ يُـدْنِينَ مِـن جلابيـبهِنَّ ذلـك أدنـى أن يُعرفنَ فلا يُؤذينَ وكـان الله غفـوراً رحيمـا) (الاحـزاب: ٥٩)، ئەمـە شـەرعێکە تیایـدا دابونەریتی عەرەب ڕەچاوکراوە، ئەو گەل و هۆزانەی پەچەپۆشین تیایاندا باو نییە ئەم حوکمە نایانگرێتەوە، کەواتە دیاریکردنی واتای گونجانی یاساکانی ئیسلام بـۆ هەموو سەردەمێك بەوە دەبێت کە حوکمەکانی گشتی بن، چـەمك و واتاگـەلێك بـن کە حیکمەت و بەرژەوەندییان تیا بێت، بگونجێن بۆ ئەوەی لقی جۆراوجۆر و چەند حوکمی تری لێ بکەوێتەوە بەڵام مەبەست لێیان یەك شت بێت.

لەبەر ئەمە و لەسەر بنەمای مەبەستی (جیهانێتی) لە یاسادانانی ئیسلامیدا ئیبنو عاشوور ڕێگایـەك پێـشنیار دەکـات بـۆ تێگەیـشتن لـە فـەرمودە پیرۆزەکـان لەسـەر بنچینەی تێگەیشتن لەو سیاقە عەرەبییەی فەرموودەکان وەریـدەگرن و حیـسابی بـۆ دەکەن، نەك تێگەیشتن لەو فەرموودانە وەك یاسا و ڕێسایەکی ڕەها بـۆ هەڵـسوکەوت و بەبێ مەرج، لەمەوە ئیبنو عاشوور لـەو دەقانـەی پێـشتر هێنامـانن واتێـدەگات کـە لەچوارچێوەی ئەو مەبەستە ئەخلاقییانەدان کە بۆی دەگەڕێنەوە، نەك وەکو ئـەوەی کۆمەڵە وشەیەکی دابڕاوبن لە واقیع و دابونەریت، ئەمجۆرە ڕێگایە نەرمییەکی گـەورە و بێوێنە دەبەخشێتە شەریعەتی ئیـسلام و جێبەجێکردنەکـەی لـە ژینگـەی ناوچـەیی جۆراوجۆردا، بەتایبەتی لە ژینگە ناعەرەبییەکاندا.

## مەبەستەكان پێگەیەكی هاوبەشن لە نێوان ئایینزا ئیسلامییەكاندا

یـەكێك لەتایبەتمەندییـەكانی سـەدەی بیـست و یـەك دابەشـبوونێكی تـەواوە لەنێوان شوێنكەوتووانی هەموو ئایینزا و مەزهەبەكانی ئیسلام و غەیری ئیـسلامدا، دیـارترین ئـەو دابەشـبوونانەش و بـەزیانترینیان ململانێـی سـوننە و شـیعەیە، دابەشـبوونێكە زۆر كـەس پێیوایـە تـەنها پاڵنـەری سیاسـیی لـە پـشتەوەیە بـەڵام وێنەی مەزهەبی وەرگرتـووە، ئەوانـەی شـارەزان بـە ئـایینزا جیاوازەكـان تێبینـی ئـەوەیان كـردووە كـە جیاوازییـەكان لـە كـۆن و نوێـدا لـە نێـوان ئـایینزا فیقهییـە جۆراوجۆرەكـانی سـوننە و شـیعەدا لەڕاسـتیدا دەگەڕێتـەوە بـۆ جیاوازییـەك كـە دەكرێ ناوی (سیاسەت)ی لێبنێین، نەك ناوی (بیروباوەڕ)ی لێبنێـین، هەرچـۆنێك بێـت ململانیـێ و كێـشە گەیـشتووەتە هـەموو گۆڕەپانـەكان، لـە دادگاكـان، مزگەوتەكان، پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان، تەنانـەت كـار گەیـشتووەتە ململانێـی خوێنـاوی لـە زۆرێـك لـە وڵاتانـدا، بەتایبـەت سیاسـەتی نێودەوڵـەتی ئـاگری ئـەم شەڕەی زیاتر خۆشكردووە، ئەوە ڕوونە و ناشارێتەوە، ئەم ململانێیە كلتـوورێكی فراوانی پەرەپێداوە لە یەكتر نەخوێندنەوە و قبوڵنەكردنی (ئەوی تـر) و نـەتوانیین بۆ بەیەكەوە ژیان لەپێناوی بەرژەوەندی گشتیدا.

لێرەدا پاساوەكەی چارلز هۆدج (١٧٩٧ – ١٨٧٨ز) بیربهێنمەوە سوود بەخشە بۆ پێویستیی ڕێبازی مەنهەجی لە تیۆلۆجیادا لەسەر بنەمای ئەمانەی كەوا دێن:

١ ـ پێكهاتنی عەقڵی مرۆڤ وایلێدەكا نەگونجێ لە هەوڵی ئەوە دوور بكەوێتـەوە كە "مەنهەجیبوون و ڕوانینـی گـشتگیرانە و تـەوفیقی بـەكاربهێنێ دەربـارەی ئـەو شتانەی كە عەقڵ بەشێوەیەكی بەشەكی دانیان پێدادەنێت".

٢ ـ ڕێبازی مەنهەجی سوودبەخشە بـۆ كۆكردنـەوەی ڕاسـتییە تاكـەكان تـاكو شێوەیەكی بەرزتری مەعریفەیان لێ دابڕێژرێت.

٣ ـ ئـەم ڕێبـازە پێویـستە لـە پێنـاوی ڕانـانێکی تیۆروتـەواوی حەقیقـەت "بـۆ پاراستنی لە تانەلێدان".

٤ ـ ئەمە سروشتی جیهانی مادی و سروشتی وەحیە وەکو یەك هەروەکو خوای گـەورە ڕوونیکردووەتـەوە و ویـستوویەتی "مرۆڤایـەتی کۆشـش بکـات لـە لێکۆڵینەوەی دروستکراوەکانیدا، هەروەها پەیوەندی تۆکمە و ئاوێتـەیی لـە نێـوان دروسـتکراوەکانیدا بدۆزنـەوە، هـەروەها پەیوەنـدی بونیادگـەریی بەیـەکالکاو لـە نێوانیاندا.

وەك دەبینین ڕوانینی سیستماتیکی لە لێکۆڵینەوەی ئایینەکاندا بەو شێوەیەی باسکرا لەزۆر لایەنیـەوە لـە مەنهـەجی لێکۆڵینـەوەی مەبەسـتەکان دەچێت لـەلای زانایانی ئیسلام، چونکە ئەویش ـ وەك لەم نامیلکەیەدا ڕوونکراوەتـەوە ـ ڕێبازێکـە لە خوێندنەوەی دەقەکاندا دەگەڕێت بۆ بابەتە گشتییەکان و بنەڕەتییەکان، وەکو دادگەریی و ئەخلاق و جۆرەکانی بەرژەوەندی.

تیۆری مەبەستەکان کۆمەڵێك بوار دیاریی دەکات لە پێویستییە بنەڕەتییەکان، ئەوانەی شەریعەتی ئیسلام سوورە لەسەر پاراستنیان، وەکو: "پاراسـتنی ئـایین، پاراستنی نـەفس، پاراسـتنی مـاڵ و دارایـی، پارسـتنی ئـەقڵ، پاراسـتنی وەچـە" وەکو پێشتر باسکرا[(١)]، بەهەمانشێوە توێژەرانی بـواری ڕوانینـی سیـستماتیکی لـە لێکۆڵینەوەی ئایینەکاندا بە دوای بابەت و بیرۆکەی نزیك لەمانەدا دەگەڕێن، وەکـو پارێزگـاریی لـە ژیـان و تەندرووسـتی "بـە قەدەغـەکردنی خواردنـەوەی کحـول تـا ڕادەی سەرخۆشـی" وەك نموونـە، بـە لەبەرچـاوگرتنی هەڵوێـستی ئیـسلام لەمبارەیەوە، چونکە هەموو هۆشبەرێك حەرام دەکات هەرچەند کەمیش بێت یـان

١ . الغزالي، المستصفى، المجلد الأول، ص١٧٢، ابن العربي، أبوبكر المـالكي، المحصول في أصـول الفقـه، تحرير: حسين علي اليادري وسعيد فوده، ط١، عمـان، دار البيـارق، المجلـد الخـامس، ص٢٢٢، الآمـدي، الإحكام، المجلد الرابع، ص٢٨٧.

هەر جۆرێك بێت، ئەمە وەك ڕێگرییەك لە ئاكامی خراپی ئەو سەرخۆشبوونە، هەروەها ئەوان لە بەهای گرنگیدان بە خێزانیش دەكۆڵنەوە، ئەمەش نزیكە لە پاراستنی وەچە و بەرژەوەندیی خێزان[1] بەمشێوەیە بابەتەكانیتریش بەراورد بكە.

ڕوانینی مەقاصیدیانە ڕێگای خۆشكردووە بۆ زانایانی ئایینی كە كۆمەڵێك فەرمان و پرەنسیپی ئایینی دابنێن لە چوارچێوەی گشتی ئەو بنەما و ئامانجانەدا كە لە پشت فەرمان و پرەنسیپەكانەوە دەوەستن، لەجیاتی ئەوەی تێگەیشتنیان تەنها كورتهەڵبێ لەسەر شتە بەشەكی و لەیەك دابڕاوەكان كە سەیركردنی بابەتەكانە بەشێوەیەكی جوزئی، لەبەرئەوەی ئەم تێگەیشتنەی دووەم وا لە خاوەنەكەی دەكات سەیری حوكم و فەرمانەكان بكات بەشێوەیەكی حەرفی، ناتوانێت گرنگی و پێگەی بەها ئەخلاقییەكان ببینێت كە فەرمانە جۆراوجۆرەكان لە هەموو بوارە جیاوازەكاندا هەوڵی بەدی هێنانیان دەدەن، هەروەها فەرمانەكان دەگۆڕێن بە جیاوازی ژینگە و شوێنەكان كە دەبێت فەرمانەكانیان تیا جێبەجێ بكرێت.

لەبەر ئەوە من پێموایە مامەڵەكردن لەگەڵ ئایین و توێژینەوە لێی لەسەر بنەمای مەبەستەكان یان ئەوەی پێی دەڵێن ڕوانینی گشتی سیستماتیكی، دەكرێ ڕۆڵێكی گرنگ بگێڕێت لە گفتوگۆی نێوان ئایینەكاندا و لە پێشخستنی تێگەیشتنی هەر ئاینێك بۆ ئەوی تر، چونكە مەبەستەكان بەم تێڕوانینە كۆمەڵێك بابەتی گشتی دەهێنێتە ئاراوە لەپێناو دیالۆگ و تێگەیشتندا.

---

[1] . وين جروديم، الثيولوجيا المنهجية، ص١٢٤، ٢٠٨، ٢٤١،٧٨١، ١٠٠٩.

## پرسیار و وەڵام سەبارەت بە ڕەوشت

پرسیارگەلێكم پێگەیشتووە لە خەڵكییەوە لە چەند وڵاتێكەوە، هەندێكیان لە ڕێگـای پێگـەی ئـەلیكترۆنی : islamonline.net لـەم لینكـەوە readingislam,net ، لە ڕاستیدا پرسیارەكان ئاڕاستەی دیداری ئەلیكترۆنی: (بپرسە دەربارەی ئیسلام) كرابوون كە لەو پێگەیەدا هەیە، هەندێكی تریان لە ڕێگەی ئیمێڵەوە پێم گەیشتوون. هەندێك لەو پرسیارانە دەهێنم بەڵام ڕێگا بەخۆم دەدەم كە هەندێك گۆڕانكاری لە پرسیار و وەڵامەكانیشدا بكەم، بۆ ئەوەی پاڵفتەیان بكەم لەو شتانەی پەیوەندییان بەم نامیلكەیەوە نییە، ئامانجیش لەم پرسیار و وەڵامانە ڕوونكردنەوەی ئەوەیە كە چۆن دەكرێ مەبەستەكانی شەریعەت چارەسەری گونجاو پێشكەش بكەن بۆ كێشە و ئاریشەكانی سەردەم كە پەیوەستن بە شەریعەتی ئیسلامەوە، ئەمانە پرسیارگەلێكن زۆرێك لە مسوڵمانان و خەڵكانی تریش دەپرسن لێیان لە هەموو شوێنێك.

(پرسیار): كاتێك باس لە "مەبەستەكان" دەكەین لە شەریعەتدا بەگشتی باس لە "ڕەوشت" دەكەین، ئایا وانییە؟ من لەبەرئەوەی مسوڵمانێكم لە ڕۆژئاوا دەژیم بۆشاییەكی فراوان و جیاوازییەكی زۆر دەبینم لە نێوان بنەمای ئەخلاقی ئیسلام و بنەمای ئەخلاقی ڕۆژئاوادا، ئەم بۆشاییە پەیوەندی هەیە بە پرسی جێگیربوون و گۆڕانكاریی لە ڕەوشتدا، مەبەستم ئەوەیە ئەوەی لە تێڕوانینی ئیسلامدا خراپ و ناپەسەندبووە پێش چواردە سەدە ئێستاش هەر ناپەسەندە لەم ئاییندا، بەڵام ئەمە لە بنەمای ئەخلاقی ڕۆژئاواییدا بەم شێوەیە نییە، بەڵكو تێڕوانینی ئەخلاقی دەگۆڕێت و گەشەدەكات بە گۆڕانی سەردەم و كات، هیوادارم ڕاوبۆچوونی خۆتانم پێبڵێن سەبارەت بەم بابەتە.

(وەڵام): وەڵامی ئەم پرسیارە سەرەکییە لە دوو خاڵدا دەدرێتەوە:

(١) پێویستە جیاوازیی بکەین لەنێوان بەها ئەخلاقیەکان (بریتین لە بەها و مەبەستە باڵاکان) و هەڵبژاردە ئەخلاقیەکاندا (ئەمانە جێبەجێکرنی ئەو بەها باڵایانەن لە ژیانی ڕۆژانەدا)، بۆیە مەبەست و بەها باڵاکانی وەکو (دادگەریی و یەکسانی و ئەمانەتپارێزی و ئازادی و خۆپاکڕاگرتن و لێبوردەیی و تاکۆتایی) ملکەچی گۆڕانکاریی نابن بە گۆڕانی کات یان شوێن، بەڵکو ئەمانە نەگۆڕن، بەڵام هەڵسوکەوتە ئەخلاقییەکان کە بریتین لە جێبەجێکردنی پڕاکتیکییانەی ئەم بەها باڵایانە لە ژیاندا، ئەوا دەکرێت بگۆڕێن بە گۆڕانی کات و شوێن، بەڵام بەو شێوە و ڕێگایەی کە بەها بنچینەییەکان بپارێزێت، بۆ نموونە دادگەریی بنچینەیەکی بنەڕەتییە لە هەموو کات و شوێنێکدا، بەڵام حوکمکردن بە دادگەریی لە کێشەی دادگاکاندا پەیوەستە بەوەی کە کۆمەڵگا بە "دادگەریی" دابنێت لە سیاقی کلتوور هەلومەرجی واقعیدا، چونکە دادگەریی دوای چەند مەرجێکی ماف دیاریکردن و دانانی ئەرك دێتەئاراوە، کە ئەو ئەرك و مافانە دەکەونە سەرشانی هەر تاکێکی خێزان یان کۆمەڵگا یان حکومەت لە چوارچێوەی ئەو سیستمە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەی پەیڕەو دەکرێت، ئەم ئەرك و مافانە دەگۆڕێن کاتێك چوینە ناو سیستمێکی کۆمەڵایەتی جیاوازەوە کە تیایدا ڕۆڵی ئەندامانی خێزان جیاوازبوو لەوانی تر، یاخود سیستمێکی ئابووری و سیاسی جیا کە لەسەر بنەمای کۆمەڵێك نەریت و مافی دیاریکراو دامەزرابێت بۆ تاك و کۆمەڵ، ئەم جیاوازییە لە تایبەتمەندیی کلتووریی - مادامێك لە چوارچێوەی ڕێگاپێدان و ئاساییدا بن - دەبێت لەبەرچاو بگیرێت کاتێك ویسترا دادگەریی جێبەجێ بکرێت.

(٢) بەڵام دەبێت جەخت لەوە بکەینەوە کە پەرستشەکان هەروەکو هەن دەبێت جێبەجێ بکرێن بەشێوەیەکی حەرفی، هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نایەت بە گۆڕانی هەلومەرجەکان، چونکە بنچینەی شەریعەتی ئیسلامین و پێویستە هەموو مسوڵمانێك پابەند بێت پێیانەوە لە هەموو کات و شوێنێکدا، بۆ نموونە پێنج

فــەرزەی نوێــژ ناگۆڕێــت (هــەروەها چــۆنیەتی نوێــژکردن، چــۆنیەتی دەســتنوێژ، ژمارەی نوێژەکان، کاتەکانیان، جووڵە و هەڵسوکەوتەکان لە سوجدە و ڕکوع، یـان نوێژخوێن چـی دەڵێـت، تـا کۆتـایی)، هـەروەها زەکاتـدان (بـە هـەموو نیـسبەت و ژمارە فەرزکراوەکانەوە، هەروەها ئەوانەی زەکاتیان پێدەدرێت تـا کۆتـایی)، لـەم پەرستشانە و ئەوانی تردا مسوڵمان شوێن پێغەمـەر (درووودی خـوای لەسـەر بێـت) دەکەوێت بەبێ تازەکردنـەوە یـان گۆڕانکـاریی، هـیچ کەسـێك نابـێ پێیوابێـت کـە حیکمەتێك یان پاساوێکی دۆزیوەتەوە کە گۆڕانکاری تیادا بکات، بەڵام ئـەو کـار و کردەوانــەی دەچــنە خانــەی (هەڵــسوکەوتەکان)ەوە ئــەوا دەگــۆڕێن بــەپێی ئــەو حیکمەتەی کە مەبەستە بەدی بهێنێت، بەپێی ڕێژەی پاساوەکانی.

بەڵام دیسان دووپاتی دەکەینەوە کە حەرامکردنی کار و کردەوەگـەلێك (وەکـو خواردنــەوەی مــەی کــەم بێــت یــان زۆر، قومــار، ســوو، زینــا) دەچــنە خانــەی پەرستــشەکانەوە بــەو تێگەیــشتنەی باسمــان کــرد، لــە قورئــان و ســوننەتدا حەرامبوونیان لە دەقی قەتعیـدا هـاتووە مـشتومڕ و ئیجتیهـاد هـەڵناگرێ، توێـژەر دەتوانێت وردبێتەوە لەو حیکمەتانەی بەهۆی نەکردنی ئـەم کارانـەوە بـەدی دێـن، دەشـتوانین لـەڕێگای وتوێـژ و تـاوتوێ کردنـی ئـەم بابەتانـەوە لـەنێوان خۆمانـدا بگەینە کۆمەڵێك حیکەت و دانایی بەوەی یـەکێکمان شـتێك بـاس بکـەین و ئـەویتر شتێکیتر، بەڵام ئەمە ئەوە ڕەتناکاتەوە کە کۆمەڵێك حوکم لە قورئـان و سـوننەتدا هــاتوون لەســەر مــسوڵمان پێویــستە پێیانــەوە پابەنــد بێــت مــادام مــسوڵمانە و ئیسلامی قبوڵە.

(پرســیار): چــۆن شــەریعەتی ئیــسلامیی دەتوانێــت یارمەتیــدەر بێــت بــۆ گەشــەکردنی ڕەوشــت لــە کۆمــەڵگای ئیــسلامییدا لــەم ســەردەمەدا، لــە کاتێکـدا گۆڕانکارییەکان خێران.

(وەڵام): شەریعەتی ئیسلامیی تایبەتمەندییەکی هەیـە تایبەتـە تـەنها بـەوەوە، ئەویش ئەوەیە لـە میانـەی فـەرزکردنی هـەر حوکمێـك لـە حوکمـە شـەرعییەکانیدا

دەیـــەوێ مەبەســـتێکی ئـــەخلاقی دیـــاریکراو بـــەدی بهێنێـــت، پەرســـتش و هەڵـسوکەوتەکان هـــەموویان بـــەبێ جیـــاوازیی ئامانجیـــان بـــەدیهێنانی مەبەسـتی ئەخلاقی دیاریکراوە، پێغەمەبەریش (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)"هـەر بـۆ ئـەوە نێـرراوە ئاکـارە جوانـــەکان تـــەواو بکـــات" هـــەروەکو خـــۆی دەربـــارەی خـــۆی فەرموویەتی، ئەگەر نموونەی دیاریکراویشمان بوێت ئەوا قورئانی پیرۆز دەربـارەی فەرزکردنی نوێژ دەفـەرموێت: (تنهـى عَـنِ الفَحـشاء والمنكـر) (العنكبـوت:٤٥)، لـە کاتی حەجکردندا دەفـەرموێت: (فَـلا رَفـثَ ولا فُـسُوقَ ولا جِـدالَ في الحَـجِّ) (البقـرة: ١٩٧)، هەروەها مەبەستیش لە زەکات (هەروەکو لە فەرموودەی پـیرۆزدا هـاتووە) ئەوەیە لە دەوڵەمەندان وەربگیرێـت و بـۆ هـەژاران بگەڕێنرێتـەوە، هـەموو حوکمـە شەرعییەکان لە بواری مامەڵەی بازرگانی و بەڵێننامەکانـدا ئامانجیـان چەسـپاندنی بـــەهای ئـــەخلاقی دیـــاریکراوە، وەکـــو پاراســـتنی مافـــە داراییـــەکان، دادگـــەریی، ئەمانەتپارێزیی، فـێڵ نـەکردن، پاراسـتنی لاوازەکـان و تـا کۆتـایی. ئەگـەر هـاتوو شـەریعەتی ئیـسلامیی بـە ڕاسـت و دروسـتی جێبـەجێکرا ئـەوا ڕەوشـتبەرزیی لـە کۆمـەڵگادا بڵاودەبێتـەوە، بـە دەربڕینێکـی تـر شـەریعەتی ئیـسلامیی "یاسـایەکی ئەخلاقییە" نەك "یاسای پیاوانی ئایینی" بە دەربڕینی هاوچەرخ.

(پرســیار): قورئـــان دەربـــارەی موحەممـــەد (دروودی خـــوای لەســـەر بێـــت) دەفەرموێت: "ڕەحمەتە بۆ هەموو جیهانیـان" چـۆن ئەمـە وایـە لـە کاتێکدا ئێمـە شەریعەتی ئیسلامیی دەبینین کە زۆر پتەو و جێگیرە؟ ئایـا دژیـەکێك نابینیـت لـە نێوان پتەوی (الصلابه) و ڕەحمەت کە ئایەتەکە باسی دەکات وەکو مەبەستێك لـە مەبەستەکانی ناردنی موحەمەد؟ هیوادارم تیشکێك بخەیتە سەر ئەم باسە.

(وەڵام): بەڵێ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسـەر بێـت) (رَحَمـة للعـالَمينَ) (الأنبياء: ١٠٧)، بـەڵام مـن کێـشەیەك لـە شـەریعەتدا نـابینم، چـونکە بریتییـە لـە سیستمی ئیسلام کە هەمووی ڕەحمەتە بۆ مرۆڤایەتی و سیـستمێکی ئـەخلاقی لـە بـاڵاترین پلـەکانی بەرزیدایـە، لـەمجۆرە سیاقانەدا هەمیـشە قـسەکەی شـەرعزانی

گـەورە (شەمـسەدین ئیبنـو لقـەییم)م بیردەکەوێتـەوە (سـاڵی ٧٤٨ك — ١٣٤٧ز وەفـاتی کـردووە) کـە دەڵـێ: "ئەسـاس و بنـچینەی شـەریعەت لەسـەر دانـایی و بەرژەوەنـدی بەنـدەکان دامـەزراوە لـە ژیـان و دواڕۆژیانـدا، هـەمووی دادگەرییـە، هەمووی ڕەحمەتـە، هـەمووی داناییـە، هـەمووی بەرژەوەندییـە، هـەر بابـەتێك لـە دادگـەریی دەرچـوو بـەرەو سـتەم، لـە ڕەحمـەت دەرچـوو بـەرەو دژەکـەی، لـە بەرژەوەندی دەرچوو بەرەو زیان، لە دانـایی دەرچـوو بـەرەو نـادانی، ئـەوا هیـچی بەسەر شەریعەتەوە نییە ئەگەر بە زۆر و بە تەئویلیش خرابێتە ناوی".

بەڵام کۆمەڵێك کێـشەی گـەورە ڕوویانـداوە بـەهۆی هەڵـە تێگەیـشتنی هەنـدێك کەس لە کۆن و نوێدا، هەندێك هەڵەی تریش لە جێبەجێکردندا، ئەمەش وایکردووە پاشمـاوەی خـراپ لـە زەینـی خەڵکانێکـدا دروسـت ببـێ بەرامبـەر بـەو کێـشە و بابەتانە، هەوەکو ئەوەی لە پرسـیارەکەتدا باسـت کـردووە، لەبەرئـەوە لەکاتێکـدا شەریعەت خۆی هەوڵی بەدیهێنانی مەبەستگەلێکی وەکـو دادگـەریی و ڕەحمـەت و دانـایی و بەرژەوەنـدی دەدات، هەنـدێك لـە خـەڵکی ئەوانـەی پۆسـتی سیاسـی و پێگەی کلتووریی گرنگیان هەیە، شەریعەت خراپ بـەکاردەهێنن بـۆ ئـەوەی ببێتـە ڕێگایەك بۆ زیادکردنی هـەواداران یـان بـۆ قـازانج، لەبەرئـەوە ئەمانـە تێگەیـشتنی تایبەتی خۆیان بۆ شەریعەت بڵاودەکەنەوە لەپێناوی دەسکەوتی دنیایی بۆ خودی خۆیان، گومانی تیا نییە نموونەی ئەمانە وێنەی شەریعەت دەشـێوێنن و زیـاتر لـە دوژمنانی زیان بە ئیسلام دەگەیەنن.

(پرسـیار): خۆشەویـستی ئامـانجێکی باڵایـە لـە ژیانـدا، گۆڕینـەوەی خۆشەویستیش لەگەڵ کەسێکی گونجاودا ئامانجێکی مرۆڤە، پلەیەکی ئاسوودەییە کـە مـرۆڤ هـەوڵی بـۆ دەدات، باشـە بۆچـی ڕێگامـان نـادرێ تـام لـە خۆشەویـستی وەرگرین بە ئارامی و دوور لە قورساییەکانی ژیانی خێزانـداریی و کێـشەکانی، ئایـا دەکـرێ بێبەشـکردنی جەسـتە لـە بـەرووبوومی خۆشەویـستی نـاوبنێین

ڕەوشـــتبەرزیی؟ ئـــەم حەرامكردنـــەش بـــە یـــەكێك لـــە لایەنـــەكانی "مەبەســـتە ئەخلاقییەكان"ی شەریعەت دابنێیین؟

(وەڵام): ئەمە یەكێكـە لـەو لایەنانـەی تیایـدا هەڵـسوكەوتی هەنـدێك كـەس لـە مـسوڵمانان ئـیسلامی ناشـرین كـردووە، ڕاسـتە خۆشەویـستی - بـەو مانایـەی تـۆ مەبەستتە - لە جوانترین نیعمەتەكانە كە خوا بە مرۆڤـی بەخـشیوە لـەم ژیانـەدا، زۆر سروشتیشە كەسێك كەسـێكیتری خـۆش بوێـت، وە حـەزی بـە پەیوەندییـەكی جەستەییش هەبێت لەگەڵیـدا كـە ئـەو خۆشەویستییە بەرجەسـتە بكـات، ئیـسلام دژایەتی ئەم سروشتە ناكات، بەڵكو ڕێكی دەخات، كێ دەڵێ ئیسلام خۆشەویستی قەدەغە دەكات؟ ئەوەی كە ئیسلام قەدەغەی كردووە تەنها پەیوەندی جەسـتەیی نێـوان دوو كەســە كــە هاوســەر نــیین، بــەڵام بۆچــی ئەمــەی قەدەغــەكردووە؟ لەبەرئــەوەی ئیــسلام هاوســەنگیی ڕاگرتــووە لــەنێوان ســۆزی خۆشەویــستی و بەهایەكی تردا، ئەویش گەشەكردنی خێـزان و ئاسـوودەییەتی، چـونكە خێـزان لـە ئیسلامدا بنچینەی ئاسوودەیی كۆمەڵگایە.

ئەگـەر هـاتوو پیـاوێكی ژنـدار یـان ئـافرەتێكی مێـرددار زینـای كـرد ئـەوا لـە تێڕوانینـی ئیـسلامەوە "تـاوان"ی ئەنجامـداوە، چـونكە كارەكـەیان ئەگەرچـی بـە بۆچـوونی خۆیـان - لەوانەیـە - دەربڕینـی خۆشەویـستی بێـت، بـەڵام بـە تـەواوی تێكگیرانە لەگەڵ مانای خێزان كە ئیسلام هەوڵ بۆ بەدیهێنانی دەدات، بەڵام ئەگەر هاتوو ئەو دوو كەسەی یەكتریان خۆشدەویست هاوسـەردار نـەبوون، ئـەوا ئیـسلام ڕێگرییان لێناكات كە هەركامێكیان ئەویتری خۆشبووێ، بەڵام ئەوەی لێیان حـەرام دەكــات ئەوەیــە ئــەو خۆشەویــستییە بــە زمــانی جەســتە دەربــڕن ئەگــەر هاوسـەرگیرییان نـەكرد بەیەكـەوە، لێرەشـدا ئـەم حوكمـە هاوسـەنگیی ڕادەگرێـت لـەنێوان خۆشەویـستی و بـەهای بنەماڵـەدا، چـونكە ئیـسلام هـانی هاوسـەرگیریی دەدات و ئاسانیشی دەكـات بـە چـەندین ڕێگـا، لەبـەر ئەمەیـە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: "هـیچ شـتێكم نـەبینیوە وەك هاوسـەرگیری بـاش

بێت بۆ ئەوانەی یەکتریان خۆشدەوێ" کەواتە ئیسلام هانی هاوسەرگیریی دەدات چونکە پرسیارێك خۆی دەسەپێنێت ئەویش ئەویە: ئایا هەڵوێست چییە بەرامبەر منداڵێك کە لە ئەنجامی پەیوەندییەکی جەستەیی دێتە دنیاوە لە نێوان دوو کەس کە هاوسەری یەکتری نین؟ ئایا لە ئینصاف و ویژدانەوەیە کۆمەڵێك منداڵ بێنە دنیاوە لە ئەنجامی پەیوەندییەك لە نێوان دوو کەسدا کە هیچ پەیوەستییەکی هاوسەرگیریی و هیچ پابەندییەك نییە لە نێوانیاندا؟

هەروەها شتێکیتر ـ دەربارەی ئەوەی لە پرسیارەکەتدا وتووتە ـ ئەگەرهاتو هەردوو هاوسەرەکە مەسەلەی منداڵبوونیان دواخست لەبەر هەر هۆیەك بێت، لەوانەیە تەمەنیان نەگونجاوبێت، یان لەبەرئەوەی تۆ ئەی پرسیارکەر ناوتناوە "قورسایی و کێشەکانی ژیانی هاوسەریی" ئەوا ئیسلام دژایەتی ناکات. بەڵام ئەگەر قەراربوو منداڵێك بێتە ئاراوە دەبێت لە چوارچێوەی خێزاندا بێت، ئەمەش بە ڕێژەیەکی زۆر منداڵان لە مافخوران ڕزگار دەکات، بەسە بۆ نموونە هێنانەوە ئەو ڕێژە زۆر و بەرەو زیادبوونەی لە سەرانسەری دنیادا هەیە لەو خێزانانەی کە یان دایك یاخود باوك بە تەنیا سەرپەرشتییان دەکەن، بە تایبەتی دایکان، کەواتە خۆشەویستی شتێکی جوانە وەکو وتت، بەڵام ئیسلام ئەمە هاوسەنگ دەکاتەوە لەگەڵ ئامانجەکانی تری کۆمەڵگا و خێزان.

(پرسیار): چۆن دەکرێ بڵێین ئیسلام سیستمێکی ئەخلاقییە لەگەڵ ئەوەدا کە هانی تیرۆر دەدات؟

(وەڵام): وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەدەمەوە کە ئەو شتانە باس بکەم کە ناچنە ناو چەمکی ڕاستەقینەی تیرۆرەوە، دواتر ئەوە چییە کە تیرۆری ڕاستەقینەیە؟ دوای ئەمانە وەڵامەکە خۆی دەدرێتەوە.

- تیرۆر هیچ ئایینێکی نییە، ڕاست نییە بە ئیسلام یان بە مەسیحیەت یان بە یەهودیەت یان بە هیندۆسی و بودایی بڵێی پەیوەندی بە تیرۆرەوە هەیە، ئایا سەرچاوەی ناسینی هەر ئایینێك کتێبە پیرۆزەکەی نییە؟ ئەگەر سەیری کتێبی

پیرۆزی هەر ئایینێك لەمانە بکەین دەبینین سەرنجدانە دەربارەی تێگەیشتن لە دروستکەر و جیهان، هەریەکێکیان شوێنکەوتووانی ڕادەهێنێت لەسەر کۆمەڵێك بنەمای ئەخلاقی دیاریکراو و بەرزکردنەوەی لایەنی ڕووحی، ئەمە لەگەڵ بوونی کۆمەڵێك جیاوازیی ئاشکرا لەنێوانیاندا بۆ گەیشتن بەو شتانە.

- تیرۆر بریتی نییە لە توندوتیژیی، چونکە هەموو کەسێکی ئاقڵ بڕوای بەوە هەیە هەندێك تووندوتیژی ڕێگاپێدراوە و پاساوداره، هەموو بڕوایان بەوە هەیە بەکارهێنانی تووندوتیژیی بۆ بەرگریی لەخۆکردن قبووڵە، چونکە لەمەدا هیچ ڕێگایەك نییە کاتێك کەسێك هێرش دەکاتە سەرت لە ڕێگایەکی گشتیدا، یان بۆ دەستگیرکردنی تاوانبارێك و سزادانیان هەندێجار توندوتیژیی بەکاردەهێنرێت (ئەمەیان ئیشی حکومەتە)، خەڵکی لە کاتی ڕاوکردندا توندوتیژیی بەکاردەهێنن (ئەگەر لەوانە نەبن کە گۆشت ناخۆن)، لەهەموو ئەم نموونانەدا خەڵکی توندوتیژیی بە هەڵە نازانن، توندوتیژیی لە خودی خۆیدا تاوان نییە، بەڵکو ئەو سیاق و شوێنەی تیایدا بەکاردەهێنرێت دەیکاتە تاوان و ئابڕووبردن.
- هەروەها بەرگریی لەخۆکردن تاوان نییە، بڕوانە ئەگەر چەند کەسێك چەکیان هەڵگرتبێ و هاتبنە ناوچەکەت، لە ماڵەکەت دەریانکردبێت، داگیریان کردبێت، بەبێ ئەوەی کەسێك بەرگریت لێبکات، ئایا لەمکاتەدا مافی خۆت نییە بەرگریی لە خۆت بکەیت؟ بەڵام ئەم بەرگری لەخۆکردنە نابێ واتلێبکات ستەم لە بێتاوانەکان بکەیت، بەڵکو دەبێت هێرش تەنها بۆ ئەوانە بێت کە هێرشیان کردووەتە سەرت.
- تیرۆر تەنها تایبەت نییە بە تاکەکان، بەڵکو گرووپی تیرۆر هەن، کەسانی مەشق پێکراو بەکاردەهێنن بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانیان، حکومەتی تیرۆریست هەیە، سوپا و چەك بەکاردەهێنن بە پلەی جیاواز بۆ لەناوبردنی بێتاوانەکان، خەڵکی زۆرجار تیرۆر بەرامبەریان دەکرێ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ،

وەکو برسیکردن، ئەشکەنجەدان، بێبەشکردن لە چاودێری تەندرووستی، ئابلۆقەی ئابووری بە شێوەیەکی فراوان، بەمشێوەیە.

- تیرۆر تایبەت نییە بەو شوێنە مەدەنییانەی کە لە شەڕدا نین، زۆرجار تیرۆر لەو شوێنانەدا ڕوودەدات کە لە حاڵەتی شەڕدان، چونکە ڕەوشتی شەڕکردن لەبیر دەکرێت لە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی سیڤیلدا، یان سەربا ز و دیلی شەڕدا.

لەبەر ئەمە هەرکارێك کە تیایدا ئازار و زیان بە خەڵکی سیڤیل و سەرباز و بێتاوانەکان بگات بەڕێگایەك کە دژی بنەماکانی دادگەریی و مافی مرۆڤ بێت، ئەوا تیرۆرە، کەواتە ئێستا دەتوانین پێناسەیەك بۆ تیرۆر بکەین بە تێڕوانینێکی مەقاصیدیانە: تیرۆر هەر کارێکە تیایدا زیان بەهەر جۆرێك لە جۆرەکان بە کۆمەڵێك خەڵکی سیڤیل یان کەسانی تر بگات بە شێوەیەك دژی بنەماکانی دادگەریی و مافەکانی مرۆڤ بێت.

# کورتەی باسەکە

جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامیی لەم سەردەمەدا (یان خراپ جێبەجێکردنی بە دیاریکراوی) لە زۆربەی کاتدا بە کورتبینییە نەك گشتگیریی، بە حەرفیە نەك ئەخلاقی، تاك ڕەهەندە نەك فرەڕەهەند، سەیری شتەکان تەنها بە ڕەش و سپی دەکات بەبێ لەبەرچاوگرتنی فرەلایەنی بابەتەکان، بە لەیەکپچڕاوی سەیر دەکرێت نەك تەواوکاریی، پشت بە ڕێنوێنی و وشە دەبەستێت نەك مەبەست و ئامانج لە پشت حوکمە شەرعییەکانەوە، لەسەروو ئەمەشەوە کەسانێك گیانبازیی (المجازفة) بەهەندێك بۆچوونەوە دەکەن وەك "دڵنیایی زانستی" (یان ئەوەی پێیدەوترێت "نائەقڵانی دوای مۆدێرنە")، هەروەها هەندێك کەس قەراری "بێگوناهی ـ العصمە" بۆ موجتەهید و ڕاوییەکان دەدەن، یان ئەوەی بەرامبەری ئەوە دەوترێت لە "مێژووییبوونی دەقە شەرعییەکان"، هەموو ئەمانە بێهێزبوونی لایەنی ڕووحی زیاد دەکەن، لێبووردەیی کەمدەکەنەوە لەگەڵ ئەوانەدا کە ڕای جیایان هەیە، هەروەها توندوتیژیی ئایدۆلۆژی زیاد دەکات، ئازادییەکان بەرتەسك دەکاتەوە، دەستی سیستمە دیکتاتۆرییەکانیش کراوەتر دەکات، لەبەرئەوە تیۆری "مەبەستەکانی شەریعەت" ئاستی گفتوگۆ دەربارەی باسەکانی یاسادانانی ئیسلامیی بەرزدەکاتەوە بۆ بەرزتر لە ڕووی فەلسەفییەوە، هەروەها بەسەر ئەو جیاوازییە مێژووییانەدا زاڵ دەبێت کە بوونەتە هۆی کێشەی مەزهەبی، هەروەها کلتووری پێکەوەژیانی ئاشتییانە و لەیەکگەیشتن پەرەپێدەدات کە هەموو جیهان پێویستییەکی زۆری پێیانە، لە کۆتاییدا، دەبێت مەبەستەکان بخرێنە بورای جێبەجێکردنەوە و جێگای گرنگیپێدان بێت لەلایەن هەموو پسپۆڕێکی شەریعەتەوە و ئەوانەشی کە سیاسیەتی جۆراوجۆر دادەڕێژن، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ناو و مەزهەبیان، بەڵکو دەبێت لەسەر بنچینەی ئەوە بێت کە هەر ئیجتیهادێك تاچەند مەبەستەکان بەدی بهێنێت ئەوەندە سوودی لێوەبگیرێت.

# ناوەڕۆك

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی




دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاراستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاورۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

– هاوکاریی هەوڵ و کۆششی زانا توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

– ئاڕاستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە فیکر و مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لەڕێگەیانەوە کار و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبی و ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش، هەیە.

# سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری




سـەنتەرێکی کوردسـتانی نـاحکومی ناسیاسـیە، گرنگیـی دەدات بـە توێژینـەوە و تـاوتوێکردنی پرسـە هزرییـە بنەڕەتیـەکان بـۆ دووبـارە هێنانـەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکـان و چۆنیەتی دابەزانـدنی چـەمکە مـەعریفی و بەبایەخـەکانی ئیسلام لـەبوارە جیاوازەکانی سەردەمدا، لەسۆنگەی ئەوەوە کە هـزر و بـیری ڕەسـەن و قـووڵ بنـچینەی تێگەیشتنی ڕاست و دروستە بۆ دەقەکانی قورئان سـوننەت و دەسـتەبەری لێکدانـەوەی گونجاوە بۆیان، سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشوهەوای گونجـاو دەدات بـۆ کـارابوونی عەقڵ و بیر و ڕانانی هزریی، لەم پێناوەدا سەنتەر هەردوو سەرچـاوەی قورئـانی پـیرۆز و فـەرموودەی بـەرز و بـەڕێز بـە بـەکارهێنانی ئـامرازی زانـستە ئیـسلامیەکان و زانـستە کۆمەڵایەتی و سروشتیەکان دەکاتە بنەمای کارەکانی.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

- بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامیی لـە ناوەنـدە زانکـۆیی و پەروەردەییەکانـدا، بـە پـشت بەسـتن بـە بـەهرە و توانـا خودییـەکانی ئـەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامیی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.

- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتـە هزریەکانـدا و بێلایـەنبوون لـە پرسـە خیلافیەکانـدا خۆبـەدوورگرتن لـە بڕیـاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.

ــ کاراکردنی کەلەپوری دەوڵەمەندی ئیسلامیی و سوود وەرگرتن لەسەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامیی لەکۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانە گۆی چەمکە فیکریە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا بەرەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.

ـــ پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لەکایە فیکری و مەعریفیە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.

ـ سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بەسوود وەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

**بوارەکانی کارکردن:**

ـ نووسین بە قەڵەمی خۆماڵی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.

ــ وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکان بۆ زمانی کوردی لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردی.

ـ بەستنی کۆڕ و سازدانی سیمینار لەلایەن خاوەن بیر و ئەکادیمیانەوە.

ـ خولی ڕاهێنان و ۆرکشۆپ لەلایەن کەسان پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە.

ـــ هاوکاریکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمیەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستی.